پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامیی
(١)

# لێدانی ئافرەت:

## چارەسەرێکە بۆ ناکۆکییەکانی ژن و مێرد؟

نووسینی:
عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان

وەرگێڕانی:
مافناس: یوسف موحەممەد صالح

# ضرب المرأة:

## وسيلة لحل الخلافات الزوجية؟

عبد الحميد أحمد أبو سليمان
ترجمة:
حقوقي: يوسف محمد صالح

# لێدانی ئافرەت:

## چارەسەرێکە بۆ ناکۆکییەکانی ژن و مێرد!!

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

(١)

# لیدانی ئافرەت:

## چارەسەرێکە بۆ ناکۆکییەکانی ژن و مێرد!!

نووسینی:

د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان

وەرگێڕانی:

مافناس: یوسف موحەممەد صالّح

چاپی یەکەم

١٤٢٨ کۆچی ٢٠٠٧ زاینیی

# لێدانی ئافرەت:

## چارەسەرێکە بۆ ناکۆکییەکانی ژن و مێرد!!

* نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان.
* وەرگێڕانی: مافناس، یوسف موحەممەد صالح.
* لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، ژمارە (١).
* ژمارەی سپاردن: (١٠٦٦)ی ساڵی ٢٠٠٧ی وەزارەتی رۆشنبیری.
* چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٧.
* تیراژ: ١٠٠٠ دانە.
* چاپخانە: کۆمپانیای چاپ و پەخشی نووسەر.
* ئیمەیلی پرۆژە: iiitkurdistan@yahoo.com

# پێشکەشە..

بە هەموو ئەو دایکانەی لـە پێناو مانەوەی کەشتیی ژیانی هاوسەرێتیی و بەرانبەر بە نارەحەتی شەپۆلـەکانی دەریای هاوسەرێتیی خۆ ڕادەگـرن، بـۆ ئەوەی نەوەکانیان بە سەلامەتی بگەیەننە کەنارەکانی دەریا. (وەرگێڕ).

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەكی

خێزانی مرۆڤایەتی، بناغەی ژیانی مرۆڤە، كە لەو ڕێگایەوە بنچینەو ئاستی كاروانەكەی دەستنیشان دەكرێ، لەسەر هەڵسوكەوتی خێزان پشت دەبەسترێ بەجۆری هەڵسوكەوتی كۆمەڵگاو گەشەكردنی بونیاد و دامەزراوەكانی و بەتینی ئەندامەكانی.

دایكیش بناغەی خێزانە، ئەو خێزانەی كە ژیانی تیادا هەڵدەقوڵێ و بە چواردەوری دایك و لە سەرشانی و بە دەستی ئەو، سەرجەم ئەندامانی خێزان ڕۆح و ماددەی ژیان وەردەگرن.

ئەگەر دایكایەتی بە ئیهانە و سووككردنو بەرەڵلایی و بەدڕەوشتیی لەدەستدرا، ئەوا تام و ئاسوودە و ئاسایشی ژیان لە دەست دەچێ.

هەربۆیە، ئیسلام گرنگی زۆر دەدات بەخێزان و دایكایەتیو پارێزگارییكردن لێیان و بەرگریی دەكات لە مافو كەرامەتی خێزان، هەروەها پەیوەندیی خۆشەویستیو سۆزداریی و چاكەنواندن بەرامبەر بەیەك دەڕوێنێ لە نێوان خێزاندا.

ئەم توێژینەوەمان بە دوای یەكێك لە باسەكانی خێزاندا دەچێت، كە پەیوەندە بە كەرامەتی ئافرەتەوە، لە دوای ئەویشەوە پەیوەندە بە كەرامەتی مرۆڤەوە.

له ڕوانگەی پێویستبوونی ئیجتهادیش، بۆ وەدەستهێنانی مەبەستەکانی شەریعەت (مقاصد الشريعة)، لە دامەزراندنی خێزانو پەیوەندییەکانی لە جیهانیی ئەمڕۆماندا و گۆڕانکارییەکانی جیهان، بۆ دروستکردنی نەوەیەك، کە هەڵگری هێز و کەرامەت و ئەمانەتێك بن کە شیاوی موسڵمان بێ و توانای ڕووبەڕووبوونەوەی بەرەنگاریەکانی ئەم سەردەمە و هەڵگری پەیامی ئیسلام بێت، خوای گەورە یار و ڕێنیشاندەر بێت.

**د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان**

**٢/ ذي القعدة/ ١٤٢٢**

**٢٠٠٢/١/١٥**

# لێدانی ئافرەت: چارەسەرێکە بۆ ناکۆکییەکانی ژن و مێرد!!

لە روانینم بۆ بارودۆخی ئوممەت و جیهانی چواردەورمان و هێرشی رۆشنبیری و ژیاریی سەختی سەر ئوممەت، لەگەڵ نزمیی ئاستی ژیانو لاوازیی مافی مرۆڤ لە نێو ئوممەتدا، مانای سەرسامبوونی ئەو کەسانە دەبینم، کە بەرگریی لە ئیسلام و مافی مرۆڤ لە ئیسلامدا دەکەن، سەبارەت بە بابەتی (لێدان)ی ئافرەت، وەك مافێك بۆ پیاو و هۆکارێك بۆ دانانی سنوور بۆ ناکۆکیی نێوان ژن و مێرد و دانانی ئاستێك بۆ لادان و یاخیبوونی ئافرەت لە مێردەکەی، هۆکاری ئەو سەرسوڕمانەش لە جیهانی ئەمڕۆماندا هێندە گران نییە.

سەرەڕای ئەوە، من کاتێك دەمخوێند ڕووبەڕووی چەندین گومان بوومەوە سەبارەت بە ئیسلام، بەتایبەت لەقۆناغی خوێندنی باڵا لە وڵاتانی رۆژئاوا، هەروەها لە کاتی کاری ئیسلامیی لاویمدا لە میانەی چالاکییەکانی (یەکێتیی قوتابیانی موسوڵمان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو کەنەدا) و (کۆڕی جیهانیی بۆ لاوانی ئیسلامیی)، بەڵام من بەردەوام و بە هۆی فیکر و بەرنامەوە، چارەسەری گونجاوم دەست دەکەوت لەگەڵ تێگەیشتنی شیاو بۆ هەر گومانێك لەو گومانانە، چونکە لە بنەڕەتدا بڕوام بە راستیی پەیامی پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بە خوای بەدیهێنەر بووە، هەر لە تەمەنی منداڵیمەوە، کاتێك لە قۆناغی دواناوەندیی، ئەویش بە دید و تێڕوانین و بیرێکی پشتبەستوو بە چەند بنەمایەکی عەقڵیی و مەنهەجی و مەبدەئیی.

هەربۆیە کێشەی گومـانم لادروسـت نـەبوو، واتـە بیرکـردن لـە هـەر بابـەتێك جیادەکرێتەوە بە ڕوونی کـە ئەمـەش پاشـان توانـای خـۆڕاگریی و کۆشـش بـە دوای گەڕانو توێژینـەوە بـەهێز دەکـات، چـونکە گـەر کێـشەیەك خولّقـا، ئـەوا پێویـستی بـە چارەسـەر و تێـڕوانین و گـەڕان هەیـە، واتـە بڕێـك لـەم چەشـنە گومانی تیادا نارِوێت، بەڵام ڕەنگە تێکـەڵبوونێك (إشـكالات) هـەبێ و جیـاوازی هەیە لە نێوان گومان (الشك) و تیکەڵبوون (إشكالات)، چـونکە گومـان ڕێگـرەو سستیی دەخولقێنێ، بەڵام (تێکەڵبوون) چالاکیو هانـدانو وزە دەبەخـشێ بـە بیر و کار و ئیجتیهاد، هەربۆیە لە رابردوو ئێستاش هـەروام، کاتێـك ڕووبـەڕووی گومانێك دەبوومەوە دەربارەی ئیسلام، ئەوا ئیـشکالم لا دروسـت دەبـوو، نـەك گومـانو خـۆم سـەرقاڵ دەکـرد بـە توێژینـەوەو بیرکردنـەوە، پـشتبەستوو بـە مەنهەجی مەعریفی ئیسلامیی ڕەسەن لـە گـشتگیریی ئـەو مەنهەجـە لـە نێـوان کامڵبوونی ئایەتەکانی وەحیو ئایەتی گەردوونو پرەنسیپە عەقڵییەکان، دەبێ شارەزابوون لە حاڵەتی ئەو بابەتە، کە ئیشکالی لەسەرە و چی (سنن)ێك لە خۆ دەگرێ لەوکاتە، بۆیە توانای تێگەیشتن لە دەلالەتی وەحیو هیدایەتی ئەستەم دەبێ.

هەربۆیە مەنهەجم لە تێڕوانین لە پێشدا ڕوودەکەمە ئەو بابەتەی ناکۆکی لـە بارەوە هەیە، پاشان سروشـتی ئـەو بابەتـە لای خـۆم ڕوون دەکەمـەوە و چـی حیکمـەت و سـیفاتێك تیـادا خولّقـاوە لـە لایـەن خـوای گـەورەوە، هـەروەها چ بارودۆخی کاتییو شوێنی (زماني ومكاني) بە چواردەوری ئەو بابەتـەدا بـووە، بـۆ ئـەوەی تێگەیـشتنم هـەبێ سـەبارەت بـە دەلالـەتی ئایەتـەکانی وەحـیو ئامانجەکانی سەبارەت بەو بابەتە، کە ناکۆکییـەیان گومـانی لەسـەرە، چـونکە هەرکەسێك لە پێشدا سەیری حوکمی ئەو بابەتە بکات، ئەوا دەبێتـە چـاولێکەر

(مقلد)، كە ئەوەش ڕێگر دەبیٚ لە تیڕوانینی گشتگیریانەی واقیعو سروشت، کە پەیوەستە بە شەریعەتی خنکاندنی ڕۆشنبیریی چاولێکەر کە دوابەدوایدا ترس دێتە کایەوە سەبارەت بە لێدوان لەو بابەتانەی پیرۆزییان لەسەرە.

هەروەها پاش ئەو حاڵەتە و کە قوڵتری دەکات نەزانی دێ بە توێژینەوەی کۆمەڵناسی کە پەیوەندە بە واقیع و سروشت بە دوای خۆیدا دێنێت[1]. هەرگیز تووشی شکست نەبووم لە ناخمەوە سەبارەت بە سوودی ئەم بەرنامە گشتگیرییە، تا لە کۆتاییدا بووە هۆی تێگەیشتنی شیاو و قایلبوون، کە فەرامۆشی هیچ لە پرنسیپەکانی شەریعەتو بەها ڕەوشتییەکان و کەرامەتی مرۆڤایەتیی نەکات، هەر بۆیە بە ئاسانیی تێڕوانینی ئەو کەسانەم دەکرد، کە ئاواتەخوازی بەرگریکردن بوون لە مافی مرۆڤ لە ئیسلامو دۆزینەوەی چارەسەرو تێگەیشتنێك، کە زوڵم و ستەم لەسەر ئافرەت لابەرێت، هەروەها وەڵامی ئەو گومانانە بداتەوە، کە بە ناوی ئیسلامەوە زوڵمو زەفەربردن لە ئافرەت بکریٚ، بەتایبەت ناڵاندنی ئافرەت بە دەستی نزمیی ئاستی ڕۆشنبیریی لە زۆربەی وڵاتانی جیهان و لاوازیی جەستەیی ئافرەت بەرانبەر بە پیاو، پەیوەستبوونی منداڵ و پێداویستی ماددیی و سۆزداریی ڕاستەوخۆ بە دایکیەوە و ناڵاندنی کۆمەڵگای ئیسلامیی بە شێوەیەکی گشتیی بە دەستی هەژاریی و نەزانی و دواکەوتنەوە، کە ئەمانە زۆربەیان بە سەر ئافرەتدا دەشکێنەوە بەراورد بە پیاو، هەروەها مومارەسەکردنی مافی مرۆڤ لەم کۆمەڵگایە لە ئاستێکی نزمدایە لەبەر بڵاوبوونەوەی داپڵۆسین و ستەمی

---

[1] عبدالحميد أبوسليمان، "النظرية الإسلامية للعلاقات الدولية، إتجاهات جديدة للفكر والمنهجية الإسلامية"، پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: دکتۆر ناصر البريك – رياض – شانشینی عەرەبی سعودیی ١٩٩٣.

کۆمەڵایەتی، کە باڵی بە سەر هەمواندا کێشاوە و هەڕەشە لە ماف و کەرامەتی هەموان دەکات.

بە هۆی سەرقاڵبوونیشم بەکاری ترەوە، نەمتوانی بە شێوەیەکی بەرفراوان رووبەڕووی هەموو ئەو ئیشکالانە ببمەوە، لە نێوانیاندا ئیشکالیەتی (لێدانی ئافرەت) هەربۆیە بواری ئاوڕدانەوەم بۆ ئەو ئیشکالە نەبوو، کە ڕاستیی هەڵوێستی ئیسلام لەو بارەیەوە روون بکەمەوە لە جیهانی ئیسلامیی و جیهانی مرۆڤایەتیدا، کە ئەمڕۆ تیادا دەژین، بە هۆی ئەو سەرقاڵبوونەمەوە.

بەڵام لە کۆتاییدا توانیم بگەڕێمەوە بۆ کاری فیکریی‌و سەرلەنوێ هەموو هەست و بیرم تەرخان کرد بۆ بوارە فیکرییەکان دەربارەی دواکەوتوویی ئوممەتی ئیسلامیی و ئەو هۆکارانەی لە پشتیەوەن، هەروەها هۆکاری شکستهێنانی پڕۆژە ژیارییەکەی، کە تاکو ئەمڕۆ ئامانجە باڵاکانی وەدەست نەهێناوە، هەرچەندە بەردەوام کۆشش لە پێناویدا دەکات.

سەرەڕای چەندین هەوڵدانی زۆر و بەردەوام، کە زیاد لە هەزار ساڵ دەبێ، لەو کاتەوە ئیمامی ئەبو حامیدی غەزالی (٥٠٥ هـ /١١١١م) ئازادیی بەخشی بە هاوکارەکەی لە کتێبی (إحياء علوم الدين)و (تهافت الفلاسفة)، بۆیە خۆمم تەرخان کرد بۆ منداڵیی لە بیری ئیسلامیی و پڕۆژە ژیارییەکەی کە گوزارشت لە دوورێکی نادیاری ئەو پڕۆژەیە دەکات.

سەرەتای هەر گۆڕانێکیش بۆ دووبارە داڕشتنەوەی کەسایەتی ئیسلامیی لە ڕووی مەعریفی‌و ویژدانییەوە، مەرجێکی بنەڕەتییە، تا ئوممەت لە ئاستی بەرەنگاربوونەوەی ڕووداوەکاندا بێت.

توێژینەوەو تێڕوانین‌و بیرکردنەوەم بۆ مەسەلەی (منداڵیی) فاکتەرێکی پاڵنەر بوو کە هەستم بە ئەنجامدانی توێژینەوە و تێڕوانین کرد سەبارەت بە

(خێزان)، کە بە ئـامێزێکی بنـەڕەتیی دادەنـرێ بـۆ دروسـتکردنی کەسایەتـسی منداڵ و هەروەها خێزان (سیناء) ئەم سەردەمەیە کە لە میانەیدا دووبـارە ئـەو داڕشتنەوە دەکرێ، پاڵپشت بە پاڵنەری فیتریـی کـە لای دایـك و بـاوك هەیـە و تەنها بەرژەوەنـدیی منداڵەکـەیان لەبەرچـاودایە، بـەپێی تێـڕوانین و قەناعـەتی خۆیان، لەبەر ئەوە ئەمڕۆ توانای دابینکردنی ئامێزێکی ماددیی سەربەخۆ نییـە وەك ئەوەی ڕوویدا لە ناوچەی (سیناء)ی پێغەمبـەر موسـا (سـەلآت و سـەلامی خــوای لەســەر) کــە چــاکخوازانی لــە ئەســتۆگرت و لەســەر خەســڵەتی خۆئامادەکردنو دەستپێشخەریی پەروەردەیی ئەو نەوەیان دەکرد بـۆ ئـەوەی توانای ڕووبـەڕووی بەرەنگاریـەکانی واقیـع ببنـەوە، هـەروەك چـۆن گـەورەمان موسا (سەلامی خوای لێبێت) ڕەفتاری نواند لەگەڵ نەوەی ئیسرائیل کاتێك لـە وڵاتی میسر کۆیلە بوون.

موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) ڕۆیشتن بۆ دەشتی (سیناء) و لەوێ بەئازادیی دەشتو دەوریان دەکرد، بۆ مـاوەی چـل سـاڵ و تـوانی لـەبری ئـەو نەوە ژێردەستو ترسنۆكو بێدەسەڵاتە لەوان نەوەیەکی باوەڕدار و سەربەسـت و ئازا و چاونەترس دروست بکات، کە توانایـان هـەبێت بـە وردی کـار بکـەن و ئوممەت دامەزرێنن: (قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلاَقُو اللّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللّهِ وَاللّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ،وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ قَالُواْ رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْراً وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ، فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ اللّهِ وَقَتَلَ دَاوُودُ جَالُوتَ وَآتَاهُ اللّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُ مِمَّا يَشَاءُ وَلَوْلاَ دَفْعُ اللّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ الأَرْضُ وَلَـكِنَّ اللّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ) (البقرة: ٢٤٩، ٢٥١).

هەروەها لە کاتی تێڕوانینمان بۆ گرنگیی پەروەردەی خێزانیی، دەبێت ئەو توێژینەوە و تێڕوانینە سەبارەت بە دروستبوونی خێزان پێشەوامان بێت بۆ تێڕوانین و توێژینەوە لە پەیوەندییەکانی خێزانو هەموو ئەو هۆیانە کە کاریگەرییان هەیە لە ڕووی پەروەردەوە بە سەر منداڵ و نەوەی نوێ و پێکهاتە مەعریفییەکانو ڕۆحیەتێکی پێکهاتەکانی دەروونیی و ویژدانیی.

بۆیە لێرەدا، ڕووبەڕووی کێشەی (لێدان) بوومەوە، لە پەیوەندیی ژیانی هاوسەرێتییدا، پەیوەندیی باوکایەتیو دایکایەتیی ژن و مێرد، مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤێکی تر و باڵغێك لەگەڵ کەسێکی باڵغ.

وەك سەرەتایەکی بەرنامەیی لە تێڕوانین و توێژینەوە، لەسەرم پێویست بوو، کە گشتگیربم لە توێژینەوەو تێڕوانینی سەرجەم بوار و پەیوەندییەکان و وێنە گەورەکەی.

هەروەها لەسەرم پێویست بوو، کە پابەندی بەرنامەیی بموڕێگا نەدەم بە بەشێك کەزاڵبێ بە سەر هەمواندا، هەروەها ڕێگا نەدەم بە گومانێك، یان ڕووداوێك پرەنسیپو ئامانجی گشتیی بسڕێتەوەو کار دەکەم لە پێناو دانانی هەر شتێك لە جێگای خۆیدا.

هەروەها لەسەرم پێویست بوو، کە بەئاگا بم — لە ڕێگەی بەرنامەیەکی عەقڵیی ساغ — لە بوونی تەواوکاریی مەعریفی لە نێوان ئایەتەکانی وەحی و ئایەتەکانی گەردوون و تەواوکاریی هیدایەتی سرووش، لەگەڵ سروشتی مرۆڤ و واقیع لە کات و شوێن.

هەربۆیە پێویست بوو لەسەرم، کە سەرەتای توێژینەوەکەم ئیسلامیانە بێت لە روانگەی کەرامەتی مرۆڤ و جێنشینی و بەرپرسیاریی مرۆڤ و مافی، لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆی، هەر تەرتیبێکیش دەربارەی پەیوەندیی

مرۆڤــەکان نــەگونجاو بــوو لــە هــەر کــاتو شــوێنێك لەگــەڵ ئــەو پرنــسیپە ئیسلامیانەدا، ئەوا دوورە لە رۆحی ئیسلام و لە ویست و ئامانجەکانیەوە.

بۆیــە دەبــێ وردبــین بــین لــە تێڕوانینمــان بــۆ دەستنیــشانکردنی کەموکورییەکان لەم تەرتیباتە کە جیاوازە لەگەڵ مافی مرۆڤ و بەرپرسیارێتی بنەڕەتیی مرۆڤ، لە کاتی تاقیکردنەوەی ژیانو ئەو نەهامەتییەی کە تووشی دەبێت.

هــەمان شــتیش دەربــارەی تێگەیــشتنمان لــە کــاتی دەســتپێکردنی توێژینەوەمان لە تەرتیباتی پەیوەندیی خێزانی ئیسلامیانە، کە دەبێ چەمکی – خۆشەویستیو بەزەیی – زاڵتر بێت و بکرێ بە بەردی بناغەی – پەیوەندیی خێزانی – بەپێچەوانەوە دەبێ دووبارە وردبینیی بکرێت بۆ دەستنیشانکردنی ئەو هەڵەیە.

هەروەها لە ڕووی بەرنامەی گشتییەوە دەزانین، کە پەیامی ئیسلام بۆ هیدایەتو ڕێنیشاندەری بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ هاتوە لە هەموو کات و شوێنێکدا، هەربۆیە ڕەگەزی کاتو شوێن دەبێت کاریگەر بێت بە سەر وردەکاریی تەرتیباتی کات و شوێن لە کاتی پراکتیزەکردن بۆ وەدەستهێنانی ئەو بەرژەوەندییانە، کە پەیامی ئیسلام کاری بۆ دەکات.

هــەروەها تێڕوانینــی هــەبێت بــۆ کــات و شــوێن، بەتایبــەت لــە ســوننەتی پێغەمبەر و کەلتووری شەرعیی کە مەبەست لێی ئاڕاستەکردنی کۆمەڵگا بووە، لە هەمان کات و شوێن و لە ژێر سێبەری بارودۆخ و توانا و نەریتی ئەو کۆمەڵگایە، بەبێ ڕەچاوکردنی ئەم تێگەیشتنە و دەلالەتی ئەو تەرتیبە تایبەتە، ئەوا ئەنجامی تێڕوانینمان هەڵە دەبێت گەر پشت بە ڕەها و نەخوێندنەوەی ئەو هۆیانە ببەستین، یان درێژە بدەین بە پراکتیزەکردنی

ڕووداوە مێژووییەکان بە تێکەڵکردنی نەریتی هەڵە بۆ بارودۆخی زەمانیو مەکانی، کە جیاوازە بۆ ئەو کاتو بارودۆخەی.

هەروەها پاڵپشتمان سەبارەت بەو تێگەیشتنەمان دەربارەی ئەو پرەنسیپە بەبەرنامەیە چەند حاڵەتێکن، لەوانە: دابەزینی سرووشە بە چەند قۆناغێكو هەمەچەشنی وتاری پێغەمبەرە بەپێی کات و شوێن، هەروەها بەپێی بارودۆخی خەڵکەکە لە کاتو شوێن، لە لایەکی ترەوە، هەروەها جیاوازی فەتواو حوکمەکانو دروستبوونی چەند مەزهەبێك لە نێوان خاوەن زانستو فەتوادەرەکاندا، وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ بارودۆخی کات و شوێن، کە ئەوەش بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر موراعاتکردنی مەنهەجی ئیسلامیی بۆ ئەو ڕەهەندە یاساییە تەشریعی کۆمەڵایەتییە.

لەوحاڵەتانەشدا کە لامان مەبەستە بریتییە لە جیاوازیی مەزهەبیی زانایانی سەلەفو فەتواو ئەحکامەکانیانە، دەربارەی کاروباری خێزان بەهۆی جیاوازیی بارودۆخ و نەریت و تواناکانە لە یەك زەمەندا، کە جیاوازی مەزهەبی مالکی لە مەدینە و جەزیرەی عەرەبیی – کە هەستی خێڵەکیی تیادا زاڵە و خوێندنەوەیەکی تایبەتییان هەیە بۆ بنەماڵە و نەسەب – لە مەزهەبی حەنەفیش لە عێراق، کە جێگای ژیارە کۆنەکان بووە لە بابلەوە تاکو فارس، ئەوەش وایکرد کاریگەریی شارستانی هەبێت بە سەر تێگەیشتنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانو بوژاندنەوەی توانای کەسەکان، ئەمەش وایکرد، کە ئەو جیاوازیی و نەریتە (کاتی و شوێنییە) کاریگەریی خۆی هەبێت بە سەر تێگەیشتنی هەردوو مەزهەبەکە لە ڕووی مەرجی پەیوەستنامەی هاوسەرێتی سەبارەت بە ئەمری ویلایە و کەفائەتبوون.

هەروەها كاریگەریی كاتو شوێن لەسەر ئەحكام و فەتوای مەزهەبەكان ڕانەوەستاوە، بگرە ئەم كاریگەرییە بە سەر خودی یەك مەزهەبیشەوە بووە لە وڵاتێكەوە بۆ وڵاتێكی تر وەك ئەوە زانراوە لە مەزهەبی ئیمامی شافعی — كە لە ساڵی (٢٠٤ی كۆچی) كۆچی دوایی كردووە، كە ئەو مەزهەبە لە وڵاتی عێراق جیاوازە لە وڵاتی میسر.

تەنانەت هەندێك ئایەتی قورئانی پیرۆز هەن، كە تێگەیشتن و درككردن، بە واتاكەیان كاریگەر دەبێت بە گۆڕینی كات و شوێن و فراوانبوونی زانینی مرۆڤایەتی، كەئەمەش ڕێنیشاندەرێكە بۆ مرۆڤەكان بۆ وەدەستهینانی واتای نوێ، كە پێشتر هەستی پێنەكراوە و نەزانراوە، تاكو هاتنی ئەم سەردەمە و وەدەستهێنانی ئەو مەعریفەیە، ئەوەش بەڵگەی پیرۆزیی كتێبی خودایە، كە هیدایەتی كات و شوێن لە ئامێز بگرێتە خۆ[2].

(سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ) (فصلت: ٥٣).

لەوانە: كە زانست پەردەی لەسەر ڕاماڵی و ئەوانەی تر، كە لە داهاتوودا ڕایدەماڵێ، سەبارەت بەئیعجازی قورئان و وردبوونی وشەكانی و شاراوەبوون ئەم دەربڕینە بۆ گەیشتن بە هیدایەت، بەبێ وشككردنی حەقیقەتی دروستبوون، لەگەڵ ئەو سوننەتانە كە وردە وردە دێنە كایەوە، بە هۆی فراوانبوونی زانینی مرۆڤەكان بۆ گۆڕینی كات و شوێن، وەك مەسەلەی تەكویری شەو و ڕۆژ و هێلكەیی زەوی، كە بە دوایدا حەقیقەت خڕیی زەوی دەسەلمێنرێت، حاڵی وەك حاڵی ئەو ئەستێرەو گەڕۆكانەو شتی تر، كە

---

[2] سەرچاوەی پێشوو، تەفسیری ئایەتی: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ..)، لاپەڕە ١٦١-١٦٩، یان لە سەرچاوە ئەسڵییەكەدا بە زمانی ئینگلیزیی لاپەڕە ٦٩ — ٧٥.

هەرکەسێك ئارەزووی بە دواداچـوونی ئیعجـازی قورئـانو ڕاڤـەکردنی هەیـە لـە هــەموو ســەردەمێکدا بـۆ فراوانبـوونی ئـەدائو هیدایـەتی خـۆی، کـە پاشـاکان مەدرەکی مرۆڤەکان فراوان دەکات، ئەوەش وەڵامدانەوەی پێداویـستیی مرۆڤـە لە سەرجەم کات و شوێنێکدا.

هەر بۆیە، بە هەڵەدا دەچین، گەر تێڕوانینمان لـە مەسـەلەیەکی تەشـریعیی ترەوە تەنها پشتبەستین بە ڕاڤەکردنو تەرتیباتی مێـژوویی و فـەتوای لەسـەر بونیاد بکەین بەبێ گوێدان بە گۆڕانکاریی گـرنگ، کـە بـە سـەر کـات و شـوێندا هاتووە و ئـەوەش کاردانـەوەی کاریگـەریی هەیـە لەسـەر توانـا و تێگەیـشتن و ڕۆڵی مرۆڤ لە ژیانو کۆمەڵگادا، مەبەستیشمان ئەوە نییە، کـە تێڕوانینمـان بـۆ کولتوورو پێشینەی مێژوویی کۆمەڵایەتی ئیسلامیمان پشتگوێ بخەین لە بواری تەشریعات و پراکتیزە و تەرتیباتدا، بـەڵام مەبەسـتمان وەدەسـتهێنانی واتـای ئەو ئەزموونە مێژووە و پەندو عیبرەتی لێوەربگیرێتو سەرلەنوێ کاربکەین بـۆ وەدەسـتهێنانی هــەمان ئامــانج، کــە هیدایــەت و ســروش و پــەیامی ئیــسلام مەبەستیەتی.

بۆیە لەسەرمانە تێڕوانینی زانستییمان هەبێت بۆ واقیع و بارودۆخی کـات و شوێن، هـەروەها ئـەو گۆڕانکارییانـەی کـە بـە سـەر بـاری ئوممەتـدا هـاتووە و توانای زیاتری وەدەستهێناوە.

هەربۆیە، پێویستە خاوەن تێڕوانینێکی زانستیی ڕەخنەگرانە بین بـۆ کـاری ئوممەت و ئەوەی بە سەردا هاتووە و تێکەوتووە، کە بووە هـۆی لەدەسـتدانی وزە و توانای بەرەوپێشچوون و ڕۆحی سەربەرزیی و کەرامـەت، ئـەو هۆیانـەش ئەنجامەکــەی خۆبەدەســتەوەدان بــوو بەرانبــەر بــە ســتەم و ئیــستیبداد و بێدەسەڵاتیی و هەژاریی و نەزانیی و دواکەوتوویی.

ئێمـه، لێـرەدا، گـەر بـاس لـە بابـەتی (لێـدان) و شـوێنەواری هەسـت و مەشـاعیری بێڕێزیـی و ئـازاری جەسـتەیی بکـەین، لـە پێـشدا دەزانـین کـە قاعیدەیـەکی بنـەڕەتیی دەروونیـی گشتیی هەیـە، کـە ئـازاردان و ترسـاندن و تۆقاندنی دەروونیی کەرەستەی ناحەزی و نیگەتیڤ و بەرەڵایی بە دوای خۆیدا دێنێت، بەپێچەوانەوە کە خۆشەویستیو ڕێزگـرتن و متمانـەبوون ئەنجامەکـەی پۆزەتیف و بەدەمەوەهاتن و کۆشش بە دوای خۆیدا دێنێت.

هـەروەها دەزانـین، کـە ئوممـەت چـەندین زوڵـم و زەلیلـی ڕۆشـنبیریی و داگیرکاریی و دیکتاتۆریی چێشتووە، تا وای لێهاتووە کـە سـتەم و سـواربوونی ملی خەڵك و ئیستیبدادنواندن، تەنها تایبەت نییـە بـە جـەلادەکانی دەسـەڵاتو حاکمەکانەوە، بـەڵکو ئـەوە بووەتـە بەشـێك لـە ڕۆشـنبیری گشتیی ئوممـەت، دەیبینین: لە نێوان مامۆستا و منداڵی فێرخواز، مودەڕڕیس و قوتـابی، گـەورە و بـچووك، دەسـەڵاتدار و ژێردەسـتە و ژن و مێـرددا، کـە ئـەوەش مانایـەك لـە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لـە خـۆ دەگرێـت، ئـەویش (بـەهێزی) و (لاوازیـی)، واتـە هەموو بەهێزو هەموو لاوازێك لـە کۆمـەڵگادا. ئـەوەش پێـچەوانەی تێگەیـشتنی ئیـسلامییە، کـە ڕۆحـی برایـەتی و هاوکـاری دەڕوێنـێ لـە نێـو ئەندامەکانیـدا، (کالبنیان يشد بعضه بعضاً) وەك دیوارێـك کـە خـشتەکانی تێکـەڵن بـە یـەك و یەکتر دەبەستنەوە.

(کالجسد إذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر البدن بالسهر والحمى) وەك لاشـەیەك وایـە، گـەر ئەنـدامێکی ئـازاری هـەبێت ئـەوا هـەموو ئەندامـەکانی بەدەسـتی ئـەو ئـازارەوە دەنـاڵێنن، هـەروەها (المسلم أخو المسلم لايظلمه ولايحقره ولايخذله، بحسب أمريء من الشر أن يحقر أخاه المسلم، كل مسلم على المسلم حرام ماله ودمه وعرضه).

موسـولْمان بـرای موسـولْمانه، نابێـت زولْمـی لێبکـات و بێڕێزیـی بەرانبـەر بنوێنێت، هەروەها نابێت سەرشۆڕی بکات و بیدات بە دەستی سـتەمکارانەوە، بەسە بۆ کەسێك بە سووکی سەیری براکەی بکـات کـە بـەو ڕەفتـارە لـە ڕیـزی خراپەکاران دابنرێت، هەموو موسلْمانێك مالْ و خوێن و شەرەف و نامووسی برا موسولْمانەکەی لەسەر حەرامە.

(ومن لایرحم الناس لایرحمه الله) هەرکەسێك بەزەیی بە خەلْکدا نەیەتـەوە، ئەوا خـوای گـەورەش بـەزەیی پێناکـات، (إنمـا یـرحم الله مـن عبـاده الرحمـاء) خوای گەورە بەزەیی خۆی تەنها بە سەر ئـەو کەسـانەدا دەڕژێنـێ، کـە لەگـەلْ یەکتردا بەبەزەیین.

ڕەفتاری ئیسلام چۆن بووە بەرانبەر بەو کەسانە کە لـە بەنـدەکانی خۆیـان داوە، چ پیاو بێ، یان ئافرەت، کەسی لێدراو لە هۆی ئەو لێدانە ڕزگار دەکرا.

لە فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە: (لیس المؤمن بالطعان ولا اللعـان ولا الفاحش ولا البذيء).

باوەڕدار نابێت تانە لە خەلْك بـداتو بـە لەعنـەتیان بکـات، هـەروەها زمـان پیس نەبێو ئازاری خەلْك نەدات.

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (أكمل المؤمنين إيماناً أحسنهم خلقاً وخياركم خياركم لنسائهم).

باوەڕدارترین کەس ئەوەیە، کە ڕەوشتی بـەرز و جوانـە و چـاکترینیان ئـەو کەسەیە، کە لەگەلْ خێزانی خۆی چاکە.

پێغەمبەر (سەلاّت و سەلامی خوای لەسەر بێـت) جارێکیـان تـووڕە دەبـێو بەو کەسەی کە لـە خێزانـی خـۆی داوە، دەلْـێ: (يظـل أحـدكم يـضرب إمرأتـه ضرب العبد ثم يظل يعانقها ولا يستحي) واتە کەسێك بەردەوام لە خێزانی خۆی

دەدات، وەك كۆیلە ڕەفتاری لەگەڵ دەكات، پاشان شەرم نایگرێ و دەست دەخاتە ملی و باوەشی پێدا دەكات.

(ئافرەتێكی زۆر دەورەیان دابوو بە بنەماڵەی (ئالی موحەممەد) و سكالاَیان دەكرد لە دژی مێردەكانیانو ئەوانیش چاكترینیتان نەبوون).

(وكان خلقه (ﷺ) اليسر والرفق والرحمة). واتە: (ڕەوشتی پێشەوامان (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) ئاسانییو نەرمو نیانیو بەزەیی بووە).

(وما ضرب رسول الله (ﷺ) بيده امرأة قط ولا خادما ولاضرب شيئا إلا أن يجاهد في سبيل الله).

هەروەها پێغەمبەرمان (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) هەرگیز بە دەستی خۆی لە ئافرەت، یان خزمەتكارەكەی نەداوە، هەروەها لە هیچ شتێكی نەداوە، مەگەر لە پێناوی خوادا بێ.

بەم تێگەیشتنە گشتییە، دەبێ تێڕوانینمان بۆ بابەتی (لێدان)و جێشوێنی لە پەیوەندیی خێزانیی لە ڕووی (هاوسەرگێریی) و (باوكایەتی)یەوە هەبێت، بۆئەوەی تێگەیشتنی ڕاستمان دەست كەوێت، بۆ ئەم – لێدانە– و زانینی تەرتیباتی خێزانێكی ئیسلامیی دروست و ساغ، كە خێزانی ئیسلامیی بە شێوەیەكی گشتیی لەسەر بونیاد بنێین، لەم سەردەمەدا بەشێوەیەكی تایبەت، كە ئەنجامەكەی وەدەستهێنانی پەیوەندیی (خۆشەویستی و بەزەیی) بێت بۆ ئەوەی خێزان بەهێزو یەكگرتوو بێت، هەروەها ببێتە لانكەیەكی ڕۆحییو دەروونیی و ویژدانێكی هێمن بۆ كۆرپەلەی موسوڵمان، تاكو منداڵەكەی بە ئەمینداریيو بەهێزیی دروست بێتو توانای جێبەجێكردنی ئەركەكانی بە شێوەیەكی بێوێنە و توانای ڕووبەڕووبوونەوەی بەرەنگارییەكانی سەردەمی هەبێت.

سەرهەڵدانی کێشەی (لێدان) لە تەرتیباتی پەیوەندیی خێزانیی و مرۆڤایەتیدا، بە شێوەیەکی زەق و دیار خۆی دەردەخات، شوێنێکی تایبەتیش داگیردەکات، چونکە بە دەقی قورئان، ئاماژەی بۆ کراوە لەبەر ئەو تەئویلاتە مێژوویی و مومارەسەیان تەنها بۆ واتای لێدان و زللە و جەڵدکردن بە ژان و بێرێزیی، چەسپاو بووە، پاشان هەستکردن بە ژان و بێرێزی کە بە دوای خۆیدا دێنێت، بەبێ ئازارە جەستەییەو فەتواکان دەربارەی ئەو (لێدانە) لە یەك ئاستدا نین، کە هەندێکیان لێدانەکە بە سیواك و هاوشێوەکەی، وەك (قەڵەمی رەساس) و (فلچەی ددان) وەصف دەکەن.

ڕیوایەت کراوە لە عەتاوە، ئەویش لە ئیبن عەباسەوە (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لەسەربێ) کاتێك پرسیاری واتای (لێدانی بێئازار)یان، الضرب غیر المبرح، ئاڕاستە کرد، ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: (لێدان) لێرە نزیکترە لە سەرزەنشت و رازی نەبوون و تووڕەیی نێوان هاوسەرەکان، وەك لە ماناکانی ئیهانەو لێدانی دەستی و ئازاردان.

لە لایەکی ترەوە، هەندێك فەتوا هەیە، دەربارەی (لێدان) کە ئەوپەڕی توندیی لە خۆ دەگرن و دەڵێن: مەبەست لە لێدان ئەوەیە: (کەمتر بێ لە چل دانە) و (قصاص)، – ماف سەندنەوە لە لایەن دەسەڵاتەوە – لە نێوان ژن و مێردا نییە، تەنها لە حاڵەتی برینداریی و کوشتندا هەیە[3].

---

[3] (جامع البيان في تفسير القرآن) لأبي جعفر محمد بن جرير الطبري (٣١٠ك کۆچی دوایی کردووە) بە پەراوێزەکەیەوە. (تفسير غرائب القرآن ورغائب الفرقان) لنظام الدين الحسن بن محمد بن حسين القمي النيسابوري، لە تەفسیری ئایەتی: (وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً) (النساء: من الآية ٣٤)، چاپی (دار لبنان – بيروت)، بەرگی ٤ بەشی ٥، لاپەڕە ٤٠ – ٤٤.

**ئەو دەقە قورئانییەش کە باس لە بابەتی (لێدان) دەکات لـە ئایـەتی (٣٤ و ٣٥)ی سوورەتی (النساء) دا، کە خوای گەورە دەفەرموێت: (الرِّجَـالُ قَوَّامُـونَ[٤] عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنْفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ،.. إِنْ يُرِيدَا**

---

[4] قام الرجل على المرأه، بە واتای خەمخۆرییەتی و بەخێوی دەکات (تهذیب لسان العرب لإبن منظر).

(قوام أهل بیتـه) واتە هەڵسوڕێنەری کاروبـاری ماڵـه، لـە کتێبـی (المختـار الـصحاح) (القـیم) بـەڕێوەبردنی کارەکان، لە کتێبی (المعجم الوسیط).

(القوام) کۆکەی بریتییە لە (قوامون)، بە مانای دابینکردنی کارەکـان و بـەهێزە لـە ڕاپەڕانـدنی فەرمانـەکان (المنجد في اللغة والإعلام، ١٩٩٧).

ئەگەر (قەوامە) بریتی بێت لە چاکسازیی کاروبارەکانو بەڕێوەبردنی کارەکانو دابینکردنی، لـە ئەسـتۆگرتنی بەخێوکردن، گرنگە بزانین بەڕێوەبردنو دابینکردنی ژیـان بـۆ خێـزانو منـداڵو ماڵەکـەی، لـە لایـەن پیـاوەوە بـە سەرەکیترین و گرنگترین ڕۆڵ دادەنرێت، سەبارەت بە کەفالـەتیو بـەخێوکردنی منداڵـەکانی، هەربۆیـە ئـەوەیان — هاوکاری خێزان — یەکێکە لە هۆیە گرنگەکان، کە خوای گەورە دەسەڵاتو توانای بەخشیوە بـە پیـاو، هـەر بۆیـە، دەوری پێشەوایەتی بەخشی بە پیاوو لەسەری مولزەم کرد، هەروەها خوای گەورە کاروباری خێزانی ڕێکخستووە، کە ڕۆڵی پیاو (باوکی نێرینە) و ژن (دایکی مێینە) کە بەردەوام پیـاو پـشتیوانی مـاڵو خێـزانو منداڵەکـەی بکـات، ئەوانیش سەر بە باوك بن بەگرەنتی فیترەتەوە پیاو کاروباری خۆی بـە دڵـسۆزییو حەماسـەتەوە ئـەنجام دەدات لـە پێناو ژن و منداڵیدا، پێچەوانەی ئەوە، واتە دارمانی دامەزراوەی خێزان و پەرتەوازەبوونی، دەبیتە هۆی ئەوەی کـە قورسایی دەخاتە ئەستۆی دایكو منداڵ، هـەروەها لـە ڕووی دەروونیـیو مـاددییو ئاسایـشەوە، دایـكو منـداڵ، ڕووبەڕووی مەترسی دەکاتەوەو کەسایەتی منداڵ لە ڕووی پێناسەوە، تووشی پەرتـەوازەیی دەکـات، هـەروەك چـۆن دەیبینین لەو کۆمەڵگایانەی کە خێزان تیادا تووشی پووکانەوە و پەرتەوازەیی بوونو ڕۆڵی باوك لە خێزاندا ونبـووە، ئەنجامەکەی دواکەوتوویی منداڵەکان بـووە لـە ڕووی کۆمەڵایەتییـەوە و زەمینەیـەکی خـۆش کـردووە بـۆ لادان و بەرەڵڵایی و ئەنجامدانی تاوان.

هەر بۆیە، هەڵەیەکی گەورەیە، گەر ئەو ڕۆڵەی ژنو پیاو هەیانە لە دەزگای خێزاندا فەرامۆش بکرێ، وەك ڕۆڵە هاوشێوەکانی تری بواری ژیان سەیر بکرێت کە لەسەر بنچینەی توانای کەسێتی دەستنیشان دەکرێت، بە بێ گوێدان بە ڕەگەز، چ پیاو بێت، یان ژن، چونکە ڕۆڵبینین لە دەزگاکاندا لەسەر تواناو کەفائەت بونیاد دەنرێت.

بەڵام، گرنگە تێڕوانینمان هەبێت کە هەر ڕۆڵێکی ئافرەت لە هەر بوارێکی تـر شانبەشـانی ڕۆڵـی دایکایـەتی، کـە بناغەی مرۆڤایەتییە لە ناخیدایەو ناکرێت فەرامۆش بکرێت، هـەروەها لـە ڕووی سـۆزدارییو ژیانـەوە پـشت بـەو دەبەسترێت بۆ مانەوەی کۆمەڵگا، ئەمانەش دەبێت گونجاو بێـت لەگـەڵ پێداویـستی دایکایـەتی ژنو ڕۆڵیـان، کـە نابێت بکرێت بە قوربانی ئەو ڕۆڵە، هـەروەها پێـشەنگی لـە ژیـانی کۆمـەڵگادان کـە دەبێـت هـەموو هۆیـەکانی گەشبوون و گەیشتن بە ئامانجی بۆ دەستەبەر بکرێت.

إِصْلاحاً يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللَّـهَ كَـانَ عَلِيمـاً خَـبِيراً) (النـساء: مـن الآيـة ٣٤ – ٣٥).

بۆ گەیشتن لەم ئایەتە، دەبێت لەچوارچێوەی گشتیی پەیوەندیی یاسایی خێزاندا دابنرێت، بۆ ئەوەی بە جوانی لە دەلالاتی تێبگەین، وەك خوای گەورە بە تەوفیقی خۆی – لە چوارچێوەی مەفاسیدی شەریعەتو ئاین – دەیەوێت.

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً) (النساء:١).

(وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَـوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ) (الروم:٢١)

(وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَلا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَاراً لِتَعْتَدُوا وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ وَلا تَتَّخِذُوا آيَاتِ اللَّهِ هُزُواً وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَا أَنْزَلَ عَلَيْكُمْ مِنَ الْكِتَابِ وَالْحِكْمَـةِ يَعِظُكُـمْ بِـهِ وَاتَّقُـوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ) (البقرة:٢٣١)

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَـا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً) (الأحزاب:٤٩)

(الطَّلاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُـذُوا مِمَّـا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئاً إِلَّا أَنْ يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَـا حُـدُودَ اللَّـهِ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلا تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّـهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ) (البقرة:٢٢٩).

گەر بەگشتیی سەیری ئەم ئایەتانە بکەینو لە ڕوانگەی گشتیی شەریعەتو پێشەوایی پێغەمبەر لێیان بڕوانین، ئا لێرەدا ناوەڕۆکی پەیوەندیی

هاوسـەرییمان بـۆ دەردەكـەوێت، كـە بریتییـە لـە هەسـتی (خۆشەویـستی) و نەرمیو (بەزەیی) و واجبوونی (بەخێوكردن).

بـەردەوامیش هەڵـسوڕێنەری ئـەم پەیوەندییـە هاوسـەرییە (خۆشەویـستیو بەزەییو چاكەكردن) دەبێت.

بۆیە، ئەم تێگەیشتنەمان لا دروست دەبێتو پرسیارێك دێتە كایەوە، بۆچی واتای (الضرب) لێدان بە مانای ئازاردان و بێڕێزیـی بێـت؟ شـوێنی ئـەوە كـوێ دەبێت لە روانگەی تێگەیشتنی پەیوەندیی ئیسلامیی هاوسەرێتی، بەتایبەت لە ریزبەنـدیی بـەدیهێنانی ئولفـەت و خۆشەویـستی لـە نێـوان هاوسـەرەكان و چارەسـەركردنی نـاكۆكیی نێوانیـان، بەتایبـەت كاتێـك واقیعـی پەیوەندییـە كۆمەڵایەتییـەكان لـە كۆمـەڵگای ئیـسلامی هاوچـەرخو مومارەسـەكردنی خۆسەپاندن و قەسوەتی ماددیی و مەعنەوی بە سەر بەشـێك لـە ئافرەتـان بـە هەند وەردەگیرێت.

هەروەها بـە هـۆی هەنـدێك فـەتوای كولتـووری، كـە دووبـارە دەكرێتـەوە و موبالەغە و زیـادڕەویی تیادایـە سـەبارەت بـە رەهـاكردنی دەسـەڵاتی پیـاو لـە بەڕێوەبردنی كاروباری ماڵەكەی، گوایە سـەرۆك خێزانـەو خۆیـان گێـل دەكـەن لەوە كە دامەزراوەی خێزانی دەبێت لەسەر بناغەی خۆشەویستی و كامڵبوون و هاوكارییو یەكتر خزمەتكردن بونیاد بنرێت، راستیش نییە، گەر بە شێوەیەكی ناتەندروست تیگەیشتنمان هەبێت بۆ دەلالاتی دەقـەكانو بـەكاربهێنرێ بـۆ بـە كۆیلەكردنی ئافرەتو خێزان، وەك مەڕ لێخوڕین.

هەروەها ئەگەر ئاسۆی سەردەمانی رابردوو تواناكانیان سنووردار بـووە بـۆ تواناكـانی ئـافرەت و ڕۆڵیـان لـە دەرەوەی چوارچـێوەی خێـزان و زۆربـەی لێپرسراوێتی خستبووە سەرشانی پیاو، بەتایبەت لە شارەكان بۆ بەڕێوەبردنی

کاروباری خێزانیی، چونکە هێزی بازوو ئەکتیڤێکی گرنگ بووە بۆ دابینکردنی ڕۆزیی‌و ئاسایش‌و پاراستنی ئەندامانی خێزان، هەروەها پێویستیی ماڵ و خێزان، وزەی ئافرەتی بەکار دەهێنا بۆ خزمەتکردن بە ماڵ و مێردو منداڵی، ئەوەش فێڵی لاواز دەکات و مەدرەکی کەم دەکات و دەستەوسان دەبێت لە جیهانی دەرەوەی خێزان، هەر بۆیە، کۆمەڵگا هەستی بە نامۆیی دەسەڵاتی پیاو نەدەکرد لە پەیوەندیی خێزانییدا، بەڵام ئەو کارە بۆ رۆژگاری ئەمڕۆمان جیاوازە، چونکە تواناکان و هۆیەکان و بەرفراوانبوونی ئاسۆی مەعریفە، کە ڕێگەخۆشکەربوو بۆ ئافرەت لە بواری بەربڵاوبوونی بەرهەمهێنان و توانا ئابوورییە سەربەخۆکان و توانای فێربوون و هەبوونی تەکنەلۆژیایەکی گەورە لە دەرەوەی ماڵ و خێزانە بچووکەکەی لە زیادبووندایە، ئەمەش وایکرد، کە هیچ لە وێنە ڕابردووەکانی مێژوو توانای لەئامێزگرتنی ڕۆڵی تاکەکانی خێزان‌و گوزارشتکردن لە واقیع و تواناکانیان بکات.

هەربۆیە پێویستە سەرلەنوێ تێڕوانینی هەبێت بۆ تێگەیشتنی واقیع لە پەیوەندییە خێزانیەکان لە ڕووی بارودۆخی سەردەم بۆ ئەوەی دڵەڕاوکێ‌و داڕمان بەردەوام نەبێت، هەروەها چاندنی ئەو تێگەیشتنانە لە دەروونی ئەندامانی خێزاندا، بۆ ئەوەی هەر ئەندامێك هاندەر بێت بۆ بونیادنانەوەیەکی کاملٚ لەگەلٚ دیکەی ئەندامانی خێزاندا.

لەو ئیشکالانەش کە لەم توێژینەوەیەدا رووبەڕووم بووەوە، ڕاڤەکردنی واتای وشەی لێدان (الضرب) بوو لە میانەی سەردی قورئانیی بۆ مانای ژان‌و ئازاردانی جەستەیی‌و ئیهانەکردنی دەروونیی.

بەبێ ڕەچاوکردن لە ئاستی ئەم ژان و ئازارە، وەك هۆیەك لە هۆیەکانی ڕەفتارکردن لە نێوان گەورەکان، هۆیەکیش لە هۆیەکانی ملکەچکردنی ئافرەت

بــۆ وەڵامدانــەوەی ئارەزووەکــانی مێردەکــەی، هــەروەها ملکەچــکردن بــۆ گوێڕایــەڵیو موعاشــەرەکردنی مێردەکــەی، ئــەم کــارەش بــە مــومکینی نــازانم، مەگــەر ئــافرەتی موســوڵمان هەرچــۆن وەك لــە هەنــدێك ئــایینو کــەلتوور کــە دەرچــوونی نییــە لــە پەیوەنــدیی هاوســەرێتیو هــیچ ڕێگایــەکی نییــە بــۆ خۆدەربازکردنو تەڵاقدان بەبێ ڕەزامەندی و ئارەزووی مێردەکەی، وەك ئــەوان بێــت، ئــا لەوحاڵەتــەدا دەکرێــت بــچەوسێنرێتەوە و بــە زۆر وەڵامــی ئــارەزوو موعاشەرەی مێــردی بداتــەوە، بــەبێ ڕازیبــوون و ئــارەزووی خــۆی، تــەنها لــەم حاڵەتەشدا دەکرێت (لێدان) و ژان ئازاری جەستەیی و مەعنــەوی، وەك هۆیــەك بەکار بێت بۆ ئەو ئامانجە.

ئێمە زانیــاریی راســت و دروســتمان هەیــە، کــە ئەمــە دوورە لــە شــەریعەتی ئیسلامەوە، کە خێزانی لەسەر بناغەی (خۆشەویستی) و(بەزەیی) بونیادناوە و خەمی فەراهەمهێنانی سەرجەم ئەو هۆیانە بووە، کە خێزان یەکگرتوو پاڵپشتی یەکتر بن، هەروەها پاراستنی پێناسی خێزانو ئەندامەکانی لە ئەستۆ گرتووە.

هەربۆیە، ئەندامبوون لە دامــەزراوەی خێــزان لــە ئیــسلامدا، ئەنــدامبوونێکی ئارەزوومەندانەیە، بوار بە چەوساندنەوەو زۆرەملێو لادان تیایدا بەدی ناکرێت.

هەروەها مافی داوە بــە هــەردوو لایــەنی هاوســەر، کــە خێــزان بــەجێبهێڵن و کۆتایی بە پەیوەندیی هاوسەریی بهێنن، گــەر هــات و یــەکێك لــەوان ئــارەزووی مانــەوەی نــەبێت لــە خێــزانو توانــای هــەڵگرتنی ئەرکــەکانی نــەبێت، چــونکە ئەوەیان چاکترە بۆ سەرجەم ئەندامانی خێزان لــە پەیوەندییــەك کــە بــەردەوام بێت لەسەر بوغزو قین و ناکۆکیی، مێرد گــەر ژیــانی هاوســەریی بــە دڵ نــەبوو، ئەوا مافی تەڵاقدانی هەیە لە ئیسلامدا، ئافرەتیش گەر ژیانی هاوسەریی بــە دڵ نەبوو، ئەوا مافی(خولع) هەیە، کە ئەویش بریتییە لە پێدانەوەی ئەو مارەییــە،

**یان کەمتر بە ڕەزامەندیی هەردوو لایەن، بۆ ئەوەی پارە نەبێتە هۆیەك بۆ تێکدانی شیرازەی خێزان[5].**

**هەروەها ناکرێت چەوساندنەوە و (لێدان) بکرێت بە هۆکارێك و مەبەستی پێی ناچارکردنی ئافرەت بێت بەبێ ئیرادە و ئارەزووی لەسەر موعاشەرەکردن، هەروەها (لێدان) لە هەرحاڵەتێك هۆیەکی گونجاو نییە بۆ بڵاوکردنەوەی خۆشەویستی لە نێوان هاوسەران، هەروەها هۆیەکی گونجاو نییە بۆ وەدەستهێنانی وەلائی پەیوەندییەکی گەرموگوڕ و متمانەدار.**

**ئەگەر سەیری تەرتیباتی ئەو ئایەتە پیرۆزانەی سورەتی (النساء) بکەین کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد کە ئامانج لێی چاکسازیی نێوان هاوسەر بووە کاتێك ئافرەت ناشیزەو لادەر و یاخی دەبێتو ڕازی نابێت بە ژیانی هاوسەری، ئەوا ئەو تەرتیبات و ڕیزبەندییە بە دوو جۆر دەبینین:**

---

[5] گرنگە تێبینی ئەوە بکرێت، کە ئایەتی خولع (فلا جناح علیها فیما افتدت بە) هەرچەندە باسی ڕێژەی فیدیەکەی نەکردووە، بەڵام سوننەتی پیغەمبەر (ﷺ) بەرزترین ئاستی بۆ ئەو ڕێژەیە دەستنیشان کرد، کە بریتییە لە ڕێژەی مارەیی کە پیاو پێشکەشی کرد، یان هاوشێوەکەی، وەك فەرمووی: (اتردین علیە حدیقتە) ئایا باخچەکەی بۆ دەگێڕیتەوە؟ — کە کاتی خۆی مارەیی ئەو ئافرەتە بووە و ئێستا داوای جیابوونەوە دەکات بە خولع — بەبێ زیادە، چونکە گەر ڕێگە بدرێت بەوەرگرتنی پارەی زیاد لە مارەیی، ئەوا دەبێتە هۆی تێکدانی خێزان، چونکە هەندێك لە پیاوان بۆ وەدەستهێنانی پارە لەم حاڵەتەدا هەڵدەستن بە ناڕەحەتکردنی خێزانەکانیان، بۆ ئەوەی ناچار بکرێن کە داوای (خلع) بکەن بە هەر نرخێك بێت بۆ خۆڕزگارکردن، وەك تەماحێك لە پارەی ئافرەت، هەر بۆیە حیکمەت لە فیدیەی خولع دەبێت بە ڕێژەی مارەیی بێت، بۆ ئەوەی پارە نەبێتە هۆیەك لای پیاو، یان ژن، بۆ تێکدانی شیرازەی خێزان.

هەر حوکمێکیش بە قەرەبووکردنی پیاو زیاد لە مارەیی دەبێت هۆیەکانی دەستنیشان بکرێتو مەعقولیش بێ، نەك تەنها ئارەزوونەکردنی ژن بە تێکەڵاوبوون لەگەڵ پیاوەکەی، ئەمەش مافی قەرەبووکردن مسۆگەر دەکات بۆ پیاوەکەو لەو حاڵەتەدا پیاو و ژن یەکسانن لە هەموو بارودۆخێکدا.

**بەشی یەکەم:** کە پەیوەندیی بە دۆزینەوەی چارەسەر هەیە، کاتێك لادان (نشوز) و ناکۆکی دەکەوێتە نێوان ژن‌و مێرد، بەبێ هاتنی لایەنی سێیەم بۆ نێو کێشەکە، ئەمەش بە سێ هەنگاو دەکرێت کە بریتین لە:

١- ئامۆژگارییان بکەن (عظوهن).

٢- دوورکەوتنەوە لە جێگای خەوتنیان (إهجروهن في المضاجع).

٣- لێدانیان (أضربوهن).

**بەشی دووەم:** هەرکاتێك هەوڵەکانی پیاو لە چوارچێوەی خێزاندا سەری نەگرت، بەبێ دەستتێوەردانی کەسێکی بێگانە سەبارەت بە چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان و گێڕانەوەی ئاشتەوایی و گەڕاندنەوەی ئافرەت بۆ ئامێزی مێردەکەی و گوێڕایەڵی ئەوەبێ کە تایبەتە بە پەیوەندیی هاوسەرێتییەوە، لەم حاڵەتەدا، پێویستە لە سەر ژن و مێرد بگەڕێنەوە بۆ لای کەسانێکی باوەڕپێکراو و خاوەن متمانە بۆ سەیرکردنی ناکۆکیی نێوانیان و دەستنیشانکردنی هۆیەکان، بە مەبەستی حوکمدان لەسەری، پاشان ئامۆژگاری و ڕێنیشاندان و هاوکاریی هەردوولایان بە ئامانجی کۆکردنەوەیان و چاکسازیی نێوانیان.

(وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُواْ حَكَماً مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلاَحاً يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيماً خَبِيراً) (النساء: ٣٥).

هەربۆیە لامان روونە کە تەرتیباتی قورئانی، مەبەستی لە هەموو بارودۆخێك چاکسازیی نێوان ژن و مێرد بووە و پاڵپشتکردنیان بەرەو چاکسازیی و لەسەر بناغەی دەروونیی و بە هەنگاو و ئامانجێکی پۆزەتیڤانە.

بۆیە قورئان فەرمان بە پیاو دەکات، هەرکاتێك خێزانی لایدا و دوورەپەرێز بوو دەبێت لەگەڵیدا دابنیشێت و ئامۆژگاریی و گلەیی لێبکات و شتی تری بۆ

ڕوون بکاتەوە، بۆ ئەوەی پیاو دەستپێشخەر بێت و سووربوونی بە مانەوەی پەیوەندیی خێزانیو چاکسایی نێوانیان، هەروەها ئەوەی لە دڵیدایە ڕوونی بکاتەوە و جیاوازیی نێوان سروشتی هەردوولاش روون بکرێتەوە و ئەو مافانەی خۆی کە سەر بە خێزان نییە و هەیەتی ئاشکرای بکات، نەبادا خێزانی زانست و زانیاری لەو مافانەدا نەبێت و دووربین نەبێت بۆ کێشەکە.

لێرەدا، گفتوگۆو حیوار و ئاگادارکردنەوە، هەنگاوی یەکەم دەبیت بۆ چارەسەرکردنی ئەو ناکۆکیانەی، کە لە نێوان هەردوولا سەر هەڵدەداتو ڕەنگە ئافرەت بە شێوەیەکی خراپ چەکی مێینەتی لە دژی مێردەکەی بەکاربهێنیّ، کە لە ڕووی خۆگریی سێکسییەوە لاوازە بەرانبەر بە خێزانەکەی. بەڵام، گەر ئافرەت گوێی شل نەکرد بۆ وتەو ئامۆژگارییو بەرچاووڕووونی مێردەکەی، بە نەزانی، یان بە تێگەیشتنی، لێرەدا، پێویستە پیاو هەنگاوێکی دوورتر بهاوێژێت و قۆناغی کردار بگرێتە بەر، لە پاش ئامۆژگاریی و قسەکردن، ئەویش بریتییە لە (بالهجر في المضاجع) واتە نەخەوتن لەسەر یەك جێگا لەگەڵ خێزانیدا، بۆیە، ئافرەت، کە زانی مێردەکە لە رووی جنسییە و لاوازەو پێویستی بە خێزانی هەیە و توانای لاوازە لە خۆدوورخستنەوە، لە هەمانکات بینی، کە ئێستا پشت هەڵدەکات و وازیهێناوە لە خەوتن لەسەر یەك جێگا، لێرەدا بە غەریزە دەردەکەوێت بۆ ئافرەت کە کێشەکە مەترسیدارە و لە قۆناغێکی جددیدایە، زۆرجار لەم قۆناغەدا ئافرەت واز لە یاری و گەمەی لاساریی و زبریینواندن دێنێت، چونکە دەزانێت پەیوەندیی هاوسەریی لە مەترسییەکی راستەقینەدایە و ئەو لاساریی و زبریینواندنە دەبێتە هۆی دارمانی ئەو پەیوەندییە، بۆیە بڕیاری کشانەوە و گەڕانەوە دەدات و سەرلەنویّ پەیوەندیی خۆشەویستی و سۆزداریی دەگەڕێتەوە نێوانیان.

بەڵام، گەر ئافرەت لەسەر هەمان ڕەفتاری خۆی بەردەوام بوو، ئەوا مەسەلەکە دەخاتە ئاستێکی لەرزۆك و زەنگی مەترسیی دارمانی ژیانی هاوسەرێتیو لەناوچوونی لە ئارا دەبێت بە ویستی، یان نەویستی ئافرەت، مەحاڵیشە ژیانی هاوسەرێتی بەوشێوەیە بەردەوام بێت، پێویستە لەسەر هەردوولا پێشبینی ژیانێکی ناخۆش و دارمانی ژیانی خێزانیی بکەن.

ئا لێرەدا، پرسیارێك سەرهەڵدەدات، کە چی بکرێت لە لایەن ژن و مێردەوە بۆ بە ئاگابوون لەم مەترسییە و بەدواداچوون بکرێت بۆ چارەنووسی دوایی؟ بەر لەوەی کێشەی نێوانیان لە چوارچێوەی هاوسەرێتیو تایبەتمەندیی پەیوەندییەکانیان دەربچێت، پاشان خستنەڕووی کێشەو دووبەرەکی لە بەردەم لایەنی سێیەمدا: (حكم من أهله وحكم من أهلها).

بۆ ئەوەی لایەنی سێیەم تێڕوانینیان هەبێت، سەبارەت بە ناکۆکیی نێوانیان، پاشان ئامۆژگارییکردنیان بەوەی کە بەرژەوەندییان تیادایە گەر ئارەزوومەند بوون، یان جیابوونەوە بە چاکە.

پاش ئەمانە، هەنگاوی (لێدان) دێت، وەك چارەسەرێك بۆ ناکۆکییو دووبەرەکیی نێوان ژن و مێرد لە چوارچێوەی خێزاندا: (وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً) (النساء: ٣٤).

لێرەدا، مەبەستمانە، تێگەیشتن و دەلالاتی لەو وشەیە هەبێت لە چوارچێوەی چاکسازیی نێوان ژن و مێرددا، کاتێك درز و ناکۆکیی دەکەوێتە نێوانیان و ژن بە تێکەڵی لەگەڵ مێردی رازیی نییە و گوێڕایەڵی ناکات، هەرچەندە ئامۆژگاری دەکرێت و دەرکەوتنی تووڕەیی پیاویش ئەویش بە (نەخەوتن لەگەڵ خێزان).

پرسیارمان ئەوەیە: لێرە (لێدان) چ واتایەکی هەیە؟

ئایا ئەو چەمکە واتای زللە و جەڵدکردن و شێوەکانی تری لێدان، وەك ژان و ئازاری جەستەیی و ئیهانەی دەروونییە، کـە مەبەسـت پێـی چەوساندنەوەی ئافرەتە و ناچارکردنی کە بە زۆر موعاشەرەی مێردی بکات، ئەگەر ئـەو واتایـە ببەخشێت، ئایا ئامانج لەوەدا چییە؟

هەروەها ئەو جۆرە چەوساندنەوە و ملکەچییە لە ڕێگای ئازارو ئیهانـەکردن دەتوانێـت تـۆوی خۆشەویـستیو بـەزەیی لـە نێـوان ژن و مێـرددا بـچێنێت و پەیوەنـدیی نێوانیـان بـەتین بکـاتو هانـدەربێت بـۆ داوێنپـاکی و پاراسـتنی شـاراوەکان؟ یـان دەتوانێـت قـەوارەی خێـزان لـە داڕمـان و پەرتـەوازەبوون بپارێزێ!

ئایا (لێدان) بە واتای ژان و ئـازاری جەسـتەیی و دەروونیـی هاندەرێکـە بـۆ مانەوەی ژن لـە نێـو مـاڵی هاوسـەرەکەیداو پاراسـتنی ئـەو حاڵـە؟! ئایـا ئـەم (لێدانە) دەتوانێ ئافرەتی موسوڵمان بچەوسێنێتەوە کە بە باشـی مـافی خـۆی دەزانێت، هـەروەها دەزانێـت کەرامـەتی مرۆڤایـەتی پـارێزراوە، وەك ئێـستاکە باوە لە ڕۆشنبیریی ئەم سەردەمەدا؟

یان ئەو لێدانە دەتوانێت ئافرەت ملکەچ بکات بە مانـەوەی وەك دیلێـك لای مێردەکـەی و چێـشتنی زوڵـمو بـە ناخۆشـی ژیـان بردنەسـەر لەگەڵیـدا، لـە هەمانکاتدا مێرد ڕێگر و ترسی نییە کە دەستدرێژیی بکاتە سـەر خێزانەکـەی و بێڕێزیـی پێبکـات! یـان لـە ئیـسلامدا دەربـازبوونێکی ئاسـان هەیـە بـۆ خۆڕزگارکردن لەو کۆیلایەتییە، جا بە خولع، یان جیابوونەوە بێـت؟

ئەگـەر (لێـدان) بـە واتـای ژان و ئـازاری جەسـتەیی و دەروونیـی نـەبێت – هەرچەندە هەندێك لە پیاوان ئەو ئامـاژە قورئانییـە دەقۆزنـەوە، وەك پاسـاو و هۆیەك بەکاری دێنن بۆ زبرییبنواندن لە دژی ئـافرەت بـە گواسـتنەوەی هەنـدێك

**بارودۆخ، كە هەندێك لە ئافرەتان ملكەچ دەكات كە خۆڕاگربێت بە هۆی پێویستی ماددیی، یان ترس لەسەر منداڵەكانی — ئەمەش هۆكارێكی پۆزەتیڤە و گونجاوە لەگەڵ پاڵنەرە قورئانییەكان، سەبارەت بە بونیادنانی خێزان‌و پەیوەندییە ڕاستەقینەكانی، ئەمەش دڵی ئافرەت ڕادەكیشێ بۆ لای مێردەكەی بە گوێڕایەڵی‌و خۆشەویستی‌و سووربوونی بە مانەوەی لە بازنەی خێزان‌و پەیوەندییەكانی خێزان، ئایا واتای مەبەست لە قورئانی پیرۆز بە كردار بۆ چەمكی (لێدان) ئەوەیە كە پیاو مافی لێدانی خێزانی هەبێت بە واتای ژان‌و ئازاری جەستەیی‌و ئیهانەكردن بە مەبەستی ملكەچكردنی ئافرەت و بە زۆر وەڵامی ئارەزووەكانی پیاو بداتەوە ! ![6]**

---

[6] لە ئیبن كەسیرەوە ریوایەت كراوە كە ئایەتی (القوامة) لە سورەتی (النساء)دا لە حەسەنی بەسرییەوە ڕاڤە كراوە، كە هۆی دابەزینی ئایەتەكە بریتییە لەوەی ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و سكاڵای دەكرد لە دەستی مێردەكەی، كە بە زللە لێیدەدات، ئەمیش فەرمووی دەبێ (قصاص) واتە سزای بەرانبەر وەرگرێت، بەڵام خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند (الرجال قوامون علی النساء) هەر بۆیە، ئەو ئافرەتە گەڕایەوە بۆ ماڵەكەی خۆی، بەبێ وەرگرتنی (قصاص)، لە ڕیوایەتێكی تردا، هاتووە: (ئێمە مەبەستێكمان دەویست و خوای گەورەش مەبەستێكی دەویست و ئەوەی خوا ویستی چاكترە).

هەرچەندە، ئەم فەرموودەیە گەر (صحیح) و ڕاست بێت — چونكە گومانی لاوازیی لێدەكرێ، هەروەها لە كاتی گەڕانمان بە دوای ئەم فەرموودەیە لە نەسائی‌و (معاجم)و مەسانیددا دەستمان نەكەوت‌و نەبوو — سەرەڕای ئەوە ناكرێت بیكەین بە پاساوێك بۆ لێدانی جەستەیی، بەڵام هەركاتێك ئەم دیاردەیە هاتە ئاراوە لە نێو خێزاندا، چارەسەر بۆ ئەو حاڵەتە خێزانییە بە (قصاص) ناكرێت، چونكە ئەنجامدانی (قصاص) (تۆڵەسەندنەوە) بە ئاشكرایی جێبەجێ دەكرێت، ئەمەش سووككردن‌و بێڕێزیی دەبێ بەرانبەر بە پیاو، كە ئەمەش چارەسەری گونجاوو شیاو نییە، سەبارەت بە چاكسازیی نێوان ژن و مێرد و پاراستنی مافی منداڵەكان، چونكە زۆرجار ئەو چارەسەركردنە دەبێتە هۆی جیابوونەوە و تەڵاق لە نێوان ژن و مێرددا.

هەربۆیە، ئەم ئایەتە پاساو و ڕەوایەتی نادات بە بەكارهێنانی (لێدان) وەك ئازار و ژان و ئیهانەكردن، چونكە ئەوە مەبەستێكی ترە، هەر بۆیە هەستی پیرۆزی پێغەمبەر (ﷺ) بە ڕوونی ڕەفزو قایل نەبوون بووە، بە پێی پێویستی تێگەیشتنمان بۆ ئایەتەكە ئەوەیە، گەر پیاو دەستدرێژیی كرد بەرانبەر بە خێزانی بە نواندنی ڕەفتاری

ئەگەر ئافرەت مافی خولع (گێڕاندنەوەی مارەیی بۆ پیاو لە بەرامبەر وەرگرتنی تەڵاق) هەبێت لە ئیسلامدا، بێگومان (لێدان) بە مانای ئارەزووی سەرشۆڕی هیچ بوارێکی بۆ نارەخسێت لە پەیوەندییە هاوسەرییەکانو بە زۆری موعاشەرەکردن، بگرە پەیوەندیی خێزانیی لاواز دەکات و دەبێتە پاڵنەرێك، کە بەخێرایی تووشی پەرتەوازەییو داڕمان ببێت.

بۆیە پێویستە بە جددیی تێڕوانینی قووڵو زانینی دەلالەتی ئەو وشەیە و ئاسۆی ڕاستەقینەی ڕوون بکرێتەوە، پێش ئەوەی بوترێت، کە مەبەست لە وشەی (لێدان) ئەم شێوەیەیە، یان ئەوی تر.

ئەگەر سەیری سروشتی ڕیزبەندیی قورئان بکەین، کاتێك باس لە (لێدان) دەکات، دەبینین: کە ئامانجەکەی ئاڕاستەکردنی کۆششی چاکسازییو نزیکبوونەوەی ژن و مێردە، وەك هەنگاوێکی تر بۆ لابردنی دووبەرەکییو ناخۆشی بە چاکترین ڕێگا، کە دەبێتە هۆی گێڕانەوەی خۆشەویستیو گوڕی پێدەداتەوە لە نێوان ژن و مێرددا، پێش ئەوەی کێشەکەیان بخرێتە بەردەستی لایەنێك کە بێگانەیە لە پەیوەندیی خێزانییو ڕەنگە لە کەسوکار بێت، وەك داواکارییەك بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیی لە نێوان هەردوولا بە چاکترین شێوە، چ بەگەڕانەوە، یان جیابوونەوە.

ئەگەر دەرکەوت، کە توندوتیژییو ئازار و چەوسانەوە هیچ بوارێکی نییە لە پەیوەندیی خێزان و چارەسەرکردنی ئیشکالاتی خێزان، ئەی مەبەست لە

---

لێدان، ئەوا چارەسەرکردنی نێوان ژنو مێرد بە تۆڵە سەندنەوە (قصاص) نابێت، چونکە تۆڵەوەرگرتن لە پیاو، دەبێتە هۆی جیابوونەوە و تەڵاقدان.

ئەگەر زیانیش نەگەیشتە پلەی تاوان، ئەوا چاکسازیی نێوان ژنو مێرد لە پێشدایە، بەڵام گەر هاتو ژیانی هاوسەریی کەڵکی نەما، ئەوا جیابوونەوە (لە ڕێگای دادوەر (القضاء)، یان بەبێ ئەو) دەبێتە چارەسەر، بەڵام بە شێوەیەکی چاكو هێشتنەوەی خۆشیو پاراستنی بەرژەوەندییە داهاتووەکان، بەتایبەت بەرژەوەندیی ڕۆڵەکان.

چـەمکی (لێـدان) لـە میانـەی قورئانـدا سـەبارەت بـە لابردنـی هۆیـەکانی دووبەرەکیی هاوسەرییو چارەسەرکردنی ناکۆکیان چییە؟

ئایـا ئـەوە واتـای ڕاسـتەقینەی ڕاسـتەوخۆیە، کـە بـە مانـای ئـازار لێکـی بدەیتەوە، یان ئەوە واتایەکی مەجازییە؟

هەروەك چۆن قورئان لە چـەندین شـوێن بێـژەی (لێـدان)ی بـە چـەند جـۆر بەکارهێناوە، واتـە بـە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ، نموونـەش فـەرموودەی خـوای گەورە، کە دەفەرموێت: (ضَرَبَ اللّهُ مَثَلاً) (النحل: ٧٥).

یان پیتێکی (تەعەدی) بۆ زیـادکراوە لـە حاڵـەتی ناڕاسـتەوخۆ، وەك خـوای گەورە فەرموویەتی: (وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ) (النساء: ١٠١).

ئەگەر کار بە ڕاڤەکردنی (إبن عباس) ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لێبێت بکەین، ئـەوا مەبەسـت لـە (لێـدانی بێئـازار) نوسـان (المس) بـە سـیواك دەگەیـەنێت، ئەمـەش لـە ڕاسـتیدا گوزارسـت لـە (لێـدان) ناکـات بـە واتـای سـزا و ئـازار و ئەشـکەنجەی جەسـتەیی و دەروونیـی، بـەڵام ئـەو واتایـە گوزارشـتی مـاددیی دەکـات لـە جوڵاندنـەوەو (نوسـاندن) بـە سـیواك، یـان هەرشـتێکی تـر کـە هاوشـێوەی بێـت، کـە گوزارشـت لـە جددیـەتی پیـاوو ڕازینـەبوونی، هـەروەها گوزارشــت لــە تووڕەبــوون و پــشتتێکردن و دوورخــستنەوەی ژن لــە ڕووی دەروونییـەوە لـە پیـاوی کۆچـکردوو لـە جێگـادا دەکـات، ئەمـەش پێـچەوانەی لێخشاندنە، کە زۆرجار گوزارشـت لـە خۆشەویـستیو نازهـەڵگرتن دەکـات، بـە هەرحاڵ ئـەم تێگەیـشتنو ڕاڤەکردنـە شـتێکی جوانـە، چـونکە مانـای دارِمـانی پەیوەندیی ڕێزو کەرامەت دوور دەخاتەوە لە نێوان ژن و مێرد، کە پەیوەنـدیی ئولفەتو تێکەڵبوون دەیانپێچێتەوە.

**هەروەها ئەم تێگەیشتنە شوێنی (لێدان) ی تیایدا بەدی ناکرێت، بە واتای ژانو ئازارو چەوساندنەوە و شکاندنەوە.**

**پێچەوانەی ئەو وتانەی کە هەندێك لە فوقەها دەربارەی (لێدان) فەرموویانە، کە واتای لێدان کەمتر لە بیست جار، یان ڕەنگە کەمتر لە چل جار دەگەیەنێت لای ئەوان بەبێ ڕەچاوکردنی وردەکاریی، دابەشدەکرێت بە سەر ئەندامانی لەشدا، یان دابەش ناکرێت، برینداریی بە دواوە بێت، یان بریندار نەبێت، ئێسقانی شکاند، یان نەیشکاند، ئافرەت رزگاری بێت پاش لێدانەکە، یان ژیانی لەدەست بدات!!**[7]

---

[7] ابو جعفر محمد بن جرير الطبري: جامع البيان في تفسير القرآن، لە پەراوێزی: تفسير غرائب الفرقان لنظام الدين الحسن ابن محمد بن حسين القمي النيسابوري، بەرگی (٤) بەشی (٥). بە راستی وشەی (الضرب غير المبرح) لێدانێکی بێزیان، نەهاتووە،ـ وەك ئەوەی لە میانەی تەفسیری (تەبەری)دا هاتووە دەربارەی نشوزو ناکۆکی نێوان هاوسەرەکان، بەڵام لە سیاقێکی تردا هاتووە: کە پەیوەستە بە (فاحشة) کە بە ناڕاستەخۆ مەبەستی هێنانی کەسی بێگانەیە بۆ نێو جێگای خێزانیی، ئەوەش بابەتێکی ترەو پەیوەستە بە ئەمینداریيو کەرامەتی خێزان کە پەیوەندیی خێزانیی بەرەو شکست دەبات، بەتایبەت ئەم حاڵەتە بوار بە باوکانو ڕۆڵەکان و کەسوکار نادات کە هەواڵەکە بڵاوبکەنەوە، لەبەر ئەوە شوێنەواری کۆمەڵایەتیی ڕووخێنەرە، ئەو شوێنەوارە خراپەش تەنها ژنو مێرد ناگرێتەوە، بەڵکو تەشەنە دەکات بۆ باوکانیانو ڕۆڵەکانیانو کەسوکاریان، هەربۆیە، حەقی خۆیەتی کە زانایانی کۆمەڵناسیی شەرعیی تێڕوانینیان هەبێت لە جۆرە جیاوازەکانيو ئەو جۆرە شەرعیانە کە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ لە هەموو بارودۆخێك و لەلایەن لایەنە جیاجیاکانی کەسوکار، هەروەها دەسەڵاتی گشتیی بۆ ئەوەی ڕزگار بکرێن بە شێوەیەکی گشتگیرو واتاکەی هاندەر بێت بۆ پاراستنی یەکەی خێزانو پەیوەندییە پیرۆزەکانيو بەرژەوەندیی لایەنەکانو پارێزگاری لە بەهای داوێنپاکيو شێوازەکانی شەرەف بکات، تیایدا بە ڕوونی مەبەست لە بێژەرو گوێبیست، هەروەها سەرزەنشتو هەڵسەنگاندن لە ئەحواڵو بارودۆخە جیاوازەکان دەستنیشان بکرێت.

هەروەها دەبێت تێبینی ئەوە بکەین، کە باس لە (لێدانی بێزیان) لە کۆچی ماڵئاوایی (حجة الوداع)دا هاتووە، دەبێ گرنگی بەوە بدرێت لە تێگەیشتنمان لە میانەی باسی ئەو فەرموودەیە و مەبەست لێی، هەروەها دەبێ ڕیوایەتی ئەو فەرموودەیە لەسەر بنچینەی قورئان بێ، بۆ ئەوەی کەموکوڕی و زیادەڕەویی تیادا بە دەرکەوێت.

گرنگ لەوەدایە لە باسەکەماندا، کە سەرجەم ڕیوایەتەکانی: (مسلم و ترمذي و ابن ماجة و احمد) کە باس لە (لێدانی بێزیان دەکەن) مەبەست لێی ئەنجامدانی کاری فاحیشەیە لەلایەن ئافرەتەوە، یان بەشێوە ناڕاستەوخۆکەی، کە بریتییە لە هێنانی کەسی بێگانە بۆ جێگای خێزانی، دەشگونجێت هەردوو حاڵەتەکە بگرێتەوە.

**سەرەڕای سەرنجڕاکێشانی ئەم ڕاڤەکردنە، بەڵام بە دوای خۆی سێبەرو ئاماژەو کەلێن بەجێ دەهێڵێت، کە لە رابردوودا بواری — زۆرکەس خۆی دوور ناخاتەوە لە داهاتوو وەك پێشینان کە خۆیان دەپاراست لە گوناه — قۆستنەوە و خراپ بەکارهێنانی وەك پاساوێك بەکارهێنراوە بۆ ئازارو و زەرەرگەیاندن بە پشتبەستن بە ناوی ئاین لەگەڵ فەتوای هەندێك لە فەتواداران، کە مەبەست لەوشەی (الضرب) زللە و لێدان و جەڵدکردن و هاوشێوەکانیەتی.**

**هەربۆیە پێویستە تێگەیشتن و چارەسەرکردنمان دەبێت بوارێك نەڕەخسێنێت، کە هاوکار بێت بۆ خراپ بەکارهێنانی مافو دەرگای کراوە نەبێت بۆ کرداری خراپەو مەزەندەی خراپ، چونکە ئەوە باشترەو لە پێشەنگترە بە مەقاسیدی شەریعەت سەبارەت بە بنیادنانەوەی خێزان لەسەر بناغەی خۆشەویستیو بەزەیی و کەرامەت.**

---

ئەگەر هەموو ئەو ڕیوایەتانەمان کۆکردەوە، ئەوا بە ئاسانیی دەتوانین تێبینی ئەوە بکەین، کە هەندێك زیادەی پێوە لکاوە، وەك ڕوونکردنەوەیەك لە لایەن کەسی ڕاویەوە، بۆیە دەبێ ئاگاداری ئەوە بین بۆ ئەوەی زیادەکە لەگەڵ ئەصڵدا تێکەڵ نەبێ، نموونەش بۆ ئەوە لە ڕیوایەتی ئیمامی ئەحمەد، بە ژمارەی (١٩٧٧٤) سەبارەت بەو فەرموودەیە کە پێشتر ئاماژەی بۆ کراوە لە (حجة الوداع)دا کە بەڕوونیی یەکێك لە ڕیوایەتەکان زیادەیەکی هێناوە و دەڵێ: (وإن خفتم نشوزهن) ئەوەش جێگای سەرسوڕمانە، کە لە فەرموودەیەکی گشتگیردا باس لەو حاڵەتە بکاتو لە هەمانکاتدا هیچ فەرموودەیەکی تر ئاماژە بەوە ناکات.

هەر بۆیە، دەبێ تێبینی ئەوە بکەین، کە ئەو ڕیوایەتە وەك ڕیوایەتەکانی تری فەرموودەی (حجة الوداع) کە هەمووی باس لە (وطيء الفراش) دەکات، هەنگاوەکان قورئانیشو دووبارە باس لە نشوزی جیاوازییەکانو یاخیبوون ئاماژە بۆ کراو لە ئایەتی (القوامة) ناکات کە بریتییە لە ئامۆژگاریی و بەجێهێشتنی جێگای خەوتنو لێدان، بەڵام باس لە بابەتێکی تر دەکات، کە ڕەهەندێکی سەرزەنشتی هەیە، کە ڕیوایەتەکانی تر ئاماژەیان بۆ کرد، ئەویش (الفاحشة المبينة) ئەنجامدانی خراپەیەکی ئاشکرایە، ئەم ڕیوایەتە بەشێوەی کینایەت ئاماژەی بۆ دەکات، ئەویش (وطيء الفراش) کە تەنها ڕەهەندی سەرزەنشتی دەگرێتەوە کە (لێدانە)، فەرموودەکە شێوەی دەکاتو دەڵێ: چون بێت ئەویش بە لێدانی بێزیان — بە مەبەستی چاکسازییە، نەك تۆڵەسەندنەوە.

هەربۆیە بە وردیی تێبینیم دەکرد بۆ ئەم مەسەلەیە لە چوارچێوەی ئەو مەنهەجیەتە کە پێشتر لەم توێژینەوەدا ڕوونم کردەوەو ئاماژەم داوە بە ئەزەلیەتی پەیامو شەریعەتو پێویستە تێگەیشتنمان هەبێت بۆ سونەنی خودا، کە پەیوەستە بەو بابەتەو پاراستنی تایبەتمەندێتی کاتو شوێن و تێڕوانینو شیکردنەوەو ئینزیاتی ئەو دووانە دەبێت گشتگیر بێت، هەربۆیە، مۆڵەتم بەخشی بە خۆم، کە تێڕوانینم هەبێت بۆ واتاکانی وشەی (لێدان) و هاوشێوەکانی لە قورئانی پیرۆزدا، کە لە پێشدا دەبێت ڕاڤەی قورئان بە قورئان بکرێت، چونکە چاکترین ڕاڤەکردنی قورئان ئەوەیە، کە لە خودی قورئان بێتو ئامانجی شەریعەتو پرنسیپە گشتییەکان چوارچێوەی بۆ دانابێت.

کاتێکیش هەستام بە ئەژمارکردنی شێوەکانی واتای وشەی (لێدان) و هاوشێوەکانی، کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، بۆم دەرکەوت، کە بە حەڤدە شێوە هاتووە:

(وَضَرَبَ اللّهُ مَثَلاً) (النحل: ٧٦).

ئەم وشەیە لە زۆر شوێنی تری قورئانی پیرۆزدا گوزارشتی پێکراوە.

(وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ) (النساء: ١٠١).

(فَضَرَبْنَا عَلَى آذَانِهِمْ فِي الْكَهْفِ سِنِينَ عَدَداً) (الكهف: ١١).

(أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ الذِّكْرَ صَفْحاً أَن كُنتُمْ قَوْماً مُّسْرِفِينَ) (الزخرف: ٥).

(كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللّهُ الْحَقَّ وَالْبَاطِلَ) (الرعد: ١٧).

(وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ) (النور: ٣١).

(أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي فَاضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقاً فِي الْبَحْرِ) (طه: ٧٧).

(وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ وَالْمَسْكَنَةُ وَبَآؤُوْاْ بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ) (البقرة: ٦١).

(فَاضْرِبُواْ فَوْقَ الأَعْنَاقِ وَاضْرِبُواْ مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ) (الأنفال: ١٢).

(وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثاً فَاضْرِب بِّهِ وَلَا تَحْنَثْ)[٨] (ص: ٤٤).

(فَإِذا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ) (محمد: ٤).

(فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُ بَابٌ بَاطِنُهُ فِيهِ الرَّحْمَةُ وَظَاهِرُهُ مِن قِبَلِهِ الْعَذَابُ) (الحديد: ١٣).

(وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ) (النور: ٣١).

(فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمْ الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ) (محمد: ٢٧).

(فَقُلْنَا اضْرِب بِّعَصَاكَ الْحَجَرَ) (البقرة: ٦٠).

(فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْباً بِالْيَمِينِ) (الصافات: ٩٣).

**ئەگەر بە قوڵیی لە سەرجەم ئەو ئایەتانە بڕوانین، ئەوا چەندین واتا هەیە بۆ کرداری لێدان بە شێوەی (متعدية) ڕاستەوخۆ، هەروەها بە شێوەی (غير المتعدية) ناڕاستەوخۆ، کە بە شێوەیەکی مەجازی واتای دورخستن‌و جیاکردنەوەو جێهێشتن‌و دوورخراوە بەکار هاتووە– فالشيء يضرب مثلاً– بە**

[8] (الضغث) واتای (چەپکە)، موفەسیرەکان دەگێڕنەوە کە مەبەست لێی لیفی دارخورمایە کە چەندین پۆپلەی شیکراوی پێوەیە.

خوای گەورە ڕێزی داناوە بۆ نەوەی ئادەم، پێغەمبەر ئەیوبی (سەلاَت‌و سەلامی خوای لەسەر بێت) ئاڕاستە کرد، کاتێك تووڕە بوو لە خێزانەکەی لە کاتی خۆڕاگرتن لە نەخۆشی بۆ بەدیهێنانی سوێندەکەی بە لێدانی خێزانەکەی بە سەد لێدان بە (پووکانەوەی پۆپلەی ئەو لیفە) بە سەد لەبری ئەو لێدانە.

بەوەش سوێندەکەی هاتەدی، بە بێئەوەی ئەیوب (سەلامی خوای لێبێت) هەڵەیەك، یان تاوانێك ئەنجام بدات بە لێدانی خێزانەکەی، کە هەستابوو بە کارێك لای ئەو بە هەڵە دانرابوو، بێئەوەی خێزانەکەی تووشی زیان‌و بێڕێزیی بکات، هەروەك چۆن باوەڕداری خواناس ئیسماعیل کوڕی باوەڕداری خواناس ئیبراهیم (سەلاَت‌و سەلامی خوایان لەسەر بێت) ڕزگاری بوو لە سەربڕین، بەوە خەونەکەی هێنایە دی، بێئەوەی سەری کوڕەکەی ببڕێ. خوای گەورەش بەرانێکی پێشکەش کرد بۆ سەربڕین. الصافات (١٠٧).

شتێك مەفهومەکـەی لێـدان بێـت، واتـە پاككردنـەوەو جیاكردنـەوەی تـا ڕوونو ئاشكرا دەبێت.

(والضرب في الأرض) لێدان لە زەوی بە واتای سەفەرو جیابوونەوە.

(والضرب على الأذن) لێدان لە سەر گـوێ، بـە واتـای بیـستنی لـێ قەدەغـە بكرێت.

(وضــرب الـصفح عـن الـذكر) بـە واتــای دووریـیو بەجێهێـشتنو بـە گـرنگ وەرنەگرتن.

(وضرب الحق بالباطل) بە واتای جیاكردنەوەو بەدەرخستنی.

(وضرب الخمر على الجيوب) واتە شاردنەوەی سینەو بەدەرنەخستنی.

(وضرب الطريق في البحر) لەتبوونو پاڵنانی ئاو بۆ چەپو ڕاست.

(والضرب بالسور بينهم) جیاكردنەوەو قەدەغەكردنی بینینی یەكتر.

(وضرب الذل والمسكنة عليهم) بە واتای دابەزین بە سەریانداو داپۆشـینیان، وەك دەوارو جیاكردنەوەیان لە خەڵك.

(وضــرب الأعنــاق والبنــان) بــە واتـــای بــڕینو جیاكردنـــەوەی ســـەر و دوورخستنەوەی لە لاشە.

ئـەوەی مـاوە سـەبارەت بـە وشـەی (لێـدان) و هاوشـێوەكانی وەك پێـشتر هاتووە، لە لێدانی قاچەكانو دەموچاو لێدان لەبەردوو (ضغث) — كۆمـەڵێك لـە لیفی دارخورما—.

(وضرب الأصنام باليمين) بە واتای دوورخستنەوە بە هێز و پاڵنـان لـە دژی شتێك بەرەو زەوی، یان بەرەو ڕوو، یان پاڵنانی بەردێك، یان مـرۆڤ، یـان بتێـك بۆ ئەوەی دەنگ بداتەوە بە كەوتنیو ئـازارو ئیهانـە بكرێـت بـەو پاڵنانـە، یـان تەقاندنەوەی بەرد بۆ دەرهێنانی ئاو، یان ڕووخانی بتەكان.

هەروەها زۆربەی واتا بۆ چەمکی (لێدان) لە میانەی قورئاندا، بە واتای جیاکردنەوە و دوورخستنەوە و دووریی و پاڵنان (الدفع) دێت[9].

ئالێرەوە واتای گونجاو چییە بۆ وشەی (لێدان) لە میانەی بە کۆتاهێنانی دووبەرەکیی نێوان ژنو مێرد و گێڕانەوەی جەوهەری خۆشەویستیو پێکەوە مانەوەی هەردوولا لەم ئایەتە پیرۆزەدا، کە خوای گەورە دەفەرموێت:

(وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيّاً كَبِيراً، وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُواْ حَكَماً مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلاَحاً يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيماً خَبِيراً) (النساء: ٣٤، ٣٥).

ئەگەر سروشتی دارشتنی ئایەتەکەو حاڵەتەکەیو ئامانج لەتەرتیبی چاکسازییو ڕێکخستنەوەی هەردوولا لەبەرچاو بگرین، هەروەها لەبەرچاوگرتنی بەهاکانی ئیسلام سەبارەت بە ڕێزگرتن لە مرۆڤ و پاراستنی کەرامەتو مافی دیاریکردنی چارەنووس.

ئەگەر سروشتی پەیوەندی خێزانیش، کە بە ئارەزووی هەردوولا دامەزراوە لەبەرچاو بگرین، بۆ هەردوولا هەیە کە مافی کۆتاییهێنان بەو پەیوەندیە بێنن، گەر قەناعەتیان نەما پەیوەندیی نێوانیانو هیچیان موراعاتی مافی ئەوی تری نەکردو بوار نییە کە بە زۆر ئەو پەیوەندییە بەردەوام بێت.

---

[9] لە قورئانی پیرۆزدا تێبینی ئەوە دەکرێت، کە بێژەی (الضرب)ی بەکارنەهێناوە، کاتێك مەبەستی لە (لێدان) ئازاری جەستەیی بە ئامانجی سزاو سەرزەنشت، بەڵکو بێژەی (الجلد) — سەرەی جیمەکە- (بفتح الجیم)دا، هاتووە لە فەرموودەی خوای گەورە: (الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ)(النور: من الآیة٢)، لە پێشەوە هاتووە، کە جێگای هەستکردنە بە ژانو ئازار، کە مەبەست لێی (لێدانە).

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت، کە مەبەست لە مانای (لێدان) ناکرێت ئازارو بێڕێزیی بێت، بەڵکو مانا گشتییەکەی لە پێشدایە، لە میانەی داڕشتنەوەی قورئاندا، کە ئەویش بریتییە لە دووریی‌و جێهێشتن‌و جیابوونەوە، هەربۆیە، خۆ دوورخستنەوەی پیاو لە ژنەکەی‌و بەجێهێشتنی ماڵی خێزانی بە تەواوی، ئەمەیان لە سروشتی ڕیزبەندی داواکراوە لە ئیسلامدا، سەبارەت بە ئاڕاستەکردنی پەیوەندیی خێزانی، چونکە ئەوەیان هەنگاوێکی دوورترە، بە بەراورد بە تەنها جێهێشتنی جێگای خێزانیی، لەبەرئەوە جیابوونەوەی پیاو و بەجێهێشتنی ماڵی خێزانی‌و بە تەواوی دوورکەوتنەوە لە ژن‌و ماڵ، ئافرەت دەخاتە بەردەم شوێنەواری لاری‌و گوێنەدان‌و ململانێی پیاو، کە ئەنجامەکەی جیابوونەوە و تەلاقدانە، ئەمەیش هەنگاوێکی هەستپێکراوەو بوارێك دەدات بە ئافرەت، کە بەخۆدا بچێتەوە و چاوەڕوانی شوێنەواری نێگەتیڤانەی هەڵسوکەوتی خۆی لە (نشوز) یاخیبوون بکات، کەئەویش بریتییە لە جیابوونەوەو تەلاق.

بەڵام ئایا ئەوە مەبەستی ڕاستەقینەی ئافرەتە لەو هەڵسوکەوتە، یاخود بە تەواوی شوێنەوارو ئەنجامەکەی بەهەند وەرگرتووە، یان ئەوانە تەنها ئارەزوومەندێکی نەزانی‌و لاساییە، کە دەبێت ئافرەت واز لەو ڕەفتارانە بێنێت‌و بگەڕێتەوە بۆ لۆژیکی عەقڵ، مێردیش خۆی بگەڕێنێتەوە بۆ ماڵی هاوسەرەکەی، پێش ئەوەی کار لە کار بترازێت.

(لێدان)ی ئافرەت لە ماڵەوە، کە گونجاوترین‌و شیاوترین واتا بۆی لە میانەی ئاڕاستەکردنی پەیوەندیی خێزانیی کە هەردوولا لەبەردەم لێپرسراوێتی دابنرێن‌و واز لە دووبەرەکیی‌و ململانێی نەویستراو بهێنن — ئەمەیە (بەجێهێشتن‌و جیابوونەوەو دوورەپەرێزیی) — بە واتای بەجێهێشتنی ماڵی

خێزانو خۆدوورخستنەوە لە ژنو ماڵی هاوسەر، وەك هەنگاوێكی دوورتر و وانەیەكی قووڵترو كاریگەرتر، كە كۆتا هەنگاوی چارەسەرانە بێت كە دەهاوێژرێت لە نێوان هەردوولاوە بۆ پڕكردنەوەی درزەكانو كۆكردنەوەی لایەنەكان، بەرچاوڕۆشنیش دەبێت بۆ هەردوولایان، كە شوێنەواری ترسناك بە دوای لاریی و یاخیبوونو دوورەبەرەكییدا دێت، ئەویش بە تێكچوونی پەیوەستنامەی خێزانو داڕمانی.

پاش هەنگاوی جێهێشتنی ماڵی خێزان، گەر تروسكەیەك لە خۆشەویستی مابێت، ناچار دەڕۆین بۆ لای تەحكیم، ئەویش بە هاوكاری لایەنی سێیەم لە كەسوكاری ژنو مێرد، كە هەڵسوڕێنەری دیالۆگ دەبنو دەستنیشانی هۆیەكانی دووركەوتنەوەو جیابوونەوە دەكەن، پاشان چارەسەرو ڕێنمایی بۆ لایەنەكان دەستنیشان دەكەن، بە مەبەستی دانانی ئاستێك بۆ ئەو دووركەوتنەوەو ڕێگەگرتن لە تەشەنەكردنی مەسەلەكە بۆ ململانێو دووبەرەكیی و ستەمنواندن.

كۆتاهێنانیش بەو دووبەرەكییە لە نێوان ژنو مێرددا، یان بە چارەسەركردن، یاخود بە جیابوونەوەو تەڵاقدان.

(فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) (البقرة: ٢٢٩).

هەروەها ئەم تێگەیشتنە بۆ واتای (لێدان) بە مانای جیابوونەوە و بەجێهێشتنو خۆدوورخستن، بە كردار، سوننەتی پێغەمبەریش (ﷺ) دووپاتی دەكاتەوە، كاتێك نێردراوی خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) ناكۆكی كەوتە نێوان خۆیو خێزانەكانیو گوێیان نەدا بە ئامۆژگاری پێغەمبەر (ﷺ) و سووربوون لەسەر لاریی و یاخیبوونیان بە مەبەستی وەدەستهێنانی خۆشگوزەرانی، لێرەدا پێغەمبەر (ﷺ) ماڵی خێزانی بەجێهێشتو ڕووی كردە

**(المشربة) – كە شوێنێکە – بۆ ماوەی یەك مانگ لەوێ مایەوە، دوور لە ماڵو خێزانی، پاشان ئارەزوومەندیان کرد، کە گوێڕایەڵ بنو ڕازی بن بە ژیانێکی سادە، یان جیابوونەوە و تەڵاقدان بە شێوەیەکی چاك.**

**(عَسَى رَبُّهُ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُ أَزْوَاجاً خَيْراً مِّنكُنَّ) (التحريم: ٥)[10].**

**ئەو زاتە بەڕێزە (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) لەو ماوەیەدا، لێدانو ئازارو بێڕێزیی بە هەموو شێوەکانی بەرامبەر بە خێزانەکانی نەنواند، کە ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت، گەر وشەی (لێدان) بە واتای ئازاری دەروونیو جەستەییەو فەرمانێکی خواییە، لە هەمان کاتیشدا دەرمانێکە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی خێزان، ئەوا پیغەمبەر (ﷺ) پێشەنگو پێشڕەو دەبوو لە بەکارهێنانی لێدان بە شێوەیەکی کردارییو بانگەشەی بۆ دەکرد.**

**بەڵام خۆشەویست (ﷺ) لە کەسی نەداوەو فەرمانی بە لێدانی کەسیش نەکردووەو مۆڵەتی بە کەسیش نەداوە.**

---

[10] پێغەمبەر(ﷺ) پەنای نەبرد بۆ لایەنی سێیەم، کاتێك ناکۆکیی کەوتە نێوان خۆیو خێزانەکانی، ئەوەش ناکرێت بە ئاڕاستەیەکی خراپ باس بکرێت، گوایە گوێنەدانە بە فەرموودەی خوای گەورە بە گەڕانەوە بۆ (تحكيم) گەر خیزانەکانی پەشیمان نەبنەوە لە هەڵوێستیان و بەردەوام بن لە رەفتاری نشوز، پاش هەموو هەنگاوەکانی تر، کە پیاو دەبێت بیگرێتە بەر، دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) ئەو هەنگاوە فەرامۆش دەکات لەبەر نەگونجاوی لەگەڵ مەقامی پێغەمبەرایەتیدا، چونکە ئامانج لە تێڕوانینی لایەنی سێیەم بۆ کێشەکە بریتییە لە ئاگاداربوون لە ئەصڵی کێشەکەو حوکمدان بە سەریدا، لە ڕێگای دەستنیشانکردنی لایەنی هەڵەو ڕاست بەرانبەر بە ژنو مێرد و ئاگادارکردنو ڕێنیشاندەریان لە ململانێی نێوان هەردوولایان. ئەمەش ڕاست نییە لە مەقامی پێغەمبەر (ﷺ) کە نێردراوی خوایەو وەحی بۆ سەر دادەبەزێ، خۆیشی زاناترین خەڵکە بە مافو وەحی پشتیوانی دەکات، پاشان بە کردار وەحی پشتیوانی کرد لە هەڵوێستی خۆشەویست(ﷺ) خێزانەکانی ئارەزوومەند کرد بە گوێڕایەڵی پێغەمبەرو ڕازیی بوون بەو شێوەیەی کە ژیان بەسەر دەبات، یان تەڵاقدانیان، ئەگەر حوکمی خوا هات، نابێت بەندەکانی موجادەلەی لەسەر بکەن، یان ڕەتی بکەنەوە: (عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبْدِلَهُ أَزْوَاجاً خَيْراً مِنْكُنَّ) (التحريم: من الآية ٥).

هەر بۆیە، کاتێك ئیمامی (ئەبوبەکر و عومەر) ویستیان لە کچەکانیان بدەن، کە بوونە هۆی تووڕەکردنی پێغەمبەر (ﷺ) و ململانێیان کرد لەگەڵ پێغەمبەر، بەڵام ئەم زاتە بەڕێزە ڕازی نەبوو.

لاشمان زانراوە، کە هەڵسوکەوتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)و سوننەتە کردارییەکانی ئەوەیە کە بەرامبەر تێبگاتو چاوپۆشن بێت، هەربۆیە دەبینین ئەو ڕەفتارەی پێغەمبەر بەرهەمی هێناوە، کە نابێت خێزان بەردەوام بێت لەسەر لاساریی‌و دەبێت ئاستێك بۆ ئەوە دابنرێت، ئەویش جێهێشتنی ماڵی خێزان، ئەمەش کاریگەریی ڕاستەوخۆی هەیە بە سەر ئافرەتەوە، هەر بۆیە، کاتێك خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) زانیان ئەو ڕەفتارە جددییە و کەسوکاری خۆیان تورەبوون‌و بەم ڕەفتارەیان ڕازی نین، لە هەمان کاتدا بێ ئامادەبوونی پێغەمبەر لە جێگای خەوتنیاندا، هەستی پێدەکرا، ئەمانە هەمووی بەس بوون کە واز لە (نشوز) بهێنن‌و بگەڕێنەوە بۆ مەنتیقی عەقڵ، پاشان گوێڕایەڵی پێغەمبەر بکەن و ڕازیی بن بە ژیانی سادە لەگەڵیدا، هەروەك چۆن حەز دەکات و ڕازی دەبێت[11].

هەروەها بۆمان روون دەبێتەوە، کاتێك خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) سووربوون لە سەر یاخیبوونیان، پێغەمبەریش خۆی دوورخستەوەو بەجێیهێشتن بۆ ماوەی یەك مانگ، بۆ ئەوەی درکی ئەنجامی یاخیبوون‌و لاساریی خۆیان بکەن، بەبێ پەنابردنە بەر لێدان‌و ئازارو بێڕێزی نواندن، بەڵام شێوازێکی نەرمتری هێنایە کایەوە، ئەویش بەجێهێشتنی ماڵ‌و خێزان بۆ ماوەی یەك مانگ‌و بەبێئەوەی کەسوکار ئاگادار بێت لەم کێشەیە، پاشان

[11] سەیری (صحیح البخاري) بکە فەرموودەی ژمارە (٥٣٩٣) و (صحیح مسلم) فەرموودەی ژمارە (٢٧٠٤) و سونەنی(ترمذي) فەرموودەی ژمارە (٣٢٤٠) و مەسنەدی (ئەحمەد) فەرموودەی ژمارە (٢٤٥٨٨).

ئارەزوومەندیان کرد لە نێوان گوێڕایەڵی، یان جیابوونەوەو تەڵاقـدان، هەربۆیـە زوو کەوتنــە خۆیــانو زانیــان کارەکــە گەمــە نییــە و دواتــر شــوێنەواری ئــەو جیابوونـەوەیان هێنایـە پـێش چـاوی خۆیـانو زانیـان چـەند تاڵـە، هـەر بۆیـە پەشـیمان بوونـەوە، واتـا مەبەسـت لـە وشـەی (لێـدان) لـە میانـەی سـوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بە مانای کرداری جیابوونـەوەو جێهێـشتنو خۆدوورخـستنەوە دێت، کـە ئەمـەش گونجـاوترە لەگـەڵ سروشـتی دەروونیـی لـە لایـەك، لەگـەڵ ناوەڕۆکی گشتیی بۆ بەکارهێنانی بێژەی لێدان (ضرب) و هاوشێوەکان، کە بـە شـێوەیەکی مــەجازیی لــە قورئانــدا هــاتووە، لــە لایــەکی تــرەوە، ئەمانــەش پێچەوانەی تەفسیری (ئیبن عەباس) نییە (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت)، کە ئامۆژگاریی پیاو دەکات کە گوزارشت لە تووڕەبوونو ڕازیـی نـەبوونی پیـاو نابێـت لـە خـشاندنی سیواك و هاوشـێوەکانی تێپـەڕ ببێـت، وەك گوزارشـتێك لەسەر تووڕەبوون.

بەڵام بۆمان روون نییـە شـوێنەواری ئـەم خـشاندنە (اللمس) لـەم قۆناغـەدا تاچەند بە کەڵکە بۆ پیشاندانی جدییەتی تازە، شوێنەوارە خراپەکانی، پاشـان توانـای گواسـتنەوەی قۆناغەکـە بـۆ قۆنـاغێکی دوورتـرو کاریگـەرتر بێـت لـە هـەنگاوی (جێهیـشتنی جێگـای خێـزانین)و پاڵنـەر بێـت بـەرەو چارەسـەر بـە ئاشتبوونەوە، یان جیابوونەوە.

بۆیە، من پێموایـە، کـە مەبەسـت لـە واتـای (لێـدان) لـە میانـەی قورئانـدا، سەبارەت بە ڕیزبەندی چاکسازیی پەیوەندی خێزان، گـەر تووشـی پەککـەوتن، یان دوورکەوتنەوەو یاخیبوون بووەوە، ئەوا دوورکەوتنەوەی پیـاو لـە خێـزانو بەجێهێـشتنی مـاڵی هاوسـەرییە، بەشـێوەیەکی تـەواو، وەك کۆتـا هۆکـار بـۆ هەسـتکردنی ئـافرەت بــە شــوێنەواری هەڵــسوکەوتی لــە لاســارییو نــشوزو

دووركەوتنـــەوەو كـــەموكوڕی نوانـــدن لـــە مـــافی هاوســـەرێتی، بـــۆ ئـــەوەی بەرچاوڕۆشـــن بێـــت کـــە پـــاش ئـــەوە جیابوونـــەوە و تەڵاقدانـــەو درككردنـــی شوێنەوارە ترسێنەرەکانی، بەتایبەت گەر منداڵ لە نێوانیاندا هەبوو.

هەربۆیە، واتای جیابوونەوەو بەجێهێشتن لێرەدا پێشڕەوترە لە ماناکانی تر بۆ وشەی (لێدان) کـە دەڵـێ بـە مانـای لێـدانی دەسـتیو ئـازاری جەسـتەیی و چەوساندنەوە و شکاندنەوەی دەروونیی دێت!!، چونکە ئەوەیان لە سروشـتی پەیوەندیی خێزانی نییەو لە سروشتی پەیوەندیی ڕێزداریی مرۆڤەکاندا جێگـای نابێتەوە.

هەروەها ڕێگەچارەیەکیش نییە بۆ وەدەستهێنانی خۆشەویستی و بەزەییو گوێڕایـــەڵی نێـــوان ژنو مێـــرد، بەتایبـــەت لـــەم ســـەردەمەداو بـــەربڵاوبوونی ڕۆشنبیریو زانیارییەکانو تواناکانو کراوەبـوونی دەرگـای دەروونـی گـەنجان، هەروەها ئەم مانایە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەشـێوەیەکی کـرداری پاڵپـشتی دەکـات، وەك هۆکـارێکی کاریگـەر بـۆ وەدەسـتهێنانی ئامانجـەکانی ئیـسلام و مەبەسـتەکانی، لـە بونیادنـانی مـاڵی خێـزان لەسـەر بنـچینەی خۆشەویـستیو بەزەییو داوێنپاکی و ئاسایش، هەروەها خێزان لانكو ئامێزێکی بێوەی بێت بۆ پـــەروەردەکردنی کۆرپەلـــەکان لـــە ڕووی ڕۆحیـــی و دەروونیـــیو ویـــژدانی و مەعریفییەوە بە چاکترین شێوە بۆ وەدەستهێنانی خێـرو خۆشـیو هـەڵگرتنی پەیامی ئیسلام.

بێگومان زۆربەی تێگەیشتنەکانی (مفاهیم) ئوممەت لە ڕاستی لای داوە، بـە هۆی هەڵواسینی میراتی ڕۆشنبیریو فەلسەفیو نەریتی ئوممەتانی تر بە بیری ئوممەتی ئیـسلامییەوە، هـەروەها بـە هـۆی ململانـێ لـە نێـوان ناکۆکییـەکانو

دەمارگیریی لە بەگژاچوونەوە کە بووە هۆی لێڵ بینین و گەیاندنی ئوممەت بۆ ئەم ئاستە کە ئێستا دەیبینین.

ئەگەر زانیمان، کە ڕۆشنبیری فیکریی و تێگەیشتنەکان کاریگەر دەبێت بەئاستو ئاسۆی مەعریفی بەردەست لەکاتو شوێن، کە هاندەر دەبێت لە زانینی واتای سروش و ئامانجەکانی و مەدلولاتی لە کاروباری ژیان، بۆیە پێویستە لەسەر شوێنکەوتوانی زانستو مەعریفە بەردەوام بن لە تێڕوانین و ئیجتیهادبوونیان، سەبارەت بە کاروباری شەریعەت بە کۆششێکی بێوێنە، بە مەبەستی ڕزگارکردنی چەمکەکان و بەرچاوڕۆشنکردن بۆ داماڵینی پەردە لەسەر نهێنیی و شاراوەکان، هەروەها دۆزینەوەی دەلالەتی تازەی مەعریفی لە واقیعە گۆڕاوەکەی ژیان و گەردوون، بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی زیندوو تازە ناوەڕۆکی ئامانجی پەیامەکەمان و مەبەستی شەریعەت بێتەدی.

ئەوەی ئێمە بۆچوونمان لەسەری هەبوو، لەم توێژینەوەو هاوشێوەکانی — بە ڕای ئێمە — لەو بابەتانەیە، کە کۆشش و ئیجتیهادکردن تیادا بەربلاو و فراوانە، بگرە پێویستە لەسەر قوتابی زانستخوازو ئەهلی مەعریفە — لە میانەی ئاستی مەعریفی بەردەستو هەروەها لە میانەی حاڵەتو بارودۆخ و گۆڕانکارییە تازەکان — کە بەردەوام بن لە کۆشش و توێژینەوەو دەرس و ئیجتیهادکردن لە هاوشێوەی ئەم بابەتە بۆ ئەوەی ئامانجی سروش و ویستی شەریعەت لەجیهانی ئەم سەردەمەدا بێتەدی.

داوام لە خوای گەورە ئەوەیە کە ڕاستم پێکابێت و ڕێنیشاندەرم بێت بۆ خێرو چاکسازیی و کۆتا وتەمان (أن الحمدلله رب العالمین).

# د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان



– سەرۆکی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی و سەرۆکی دەزگای بوژاندنەوەی منداڵانە.

– ساڵی ١٣٥٥ك/ ١٩٣٦ز لە شاری مەککە لەدایك بووە، خوێندنی سەرەتایی و دواناوەندیی لە هەمان شار تەواو کردووە، دەرچووی قوتابخانەی ئامادەیی (نهر)ە لە ساڵی ١٣٧٤ك/ ١٩٥٥ز.

– ساڵی ١٣٧٨ك / ١٩٥٩ز بڕوانامەی بەکالۆریوسی بازرگانیی لە بەشی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی قاهیرە بەدەست هێناوە، هەروەها لە ساڵی ١٣٨١ك/ ١٩٦٣ز، بڕوانامەی ماستەری لە زانستە سیاسییەکانی کۆلیژی بازرگانیی زانکۆی قاهیرە بەدەست هێناوە.

– ساڵی ١٣٩٣ ك/ ١٩٧٣ز لە زانکۆی پەنسلڤانیا پلەی دکتۆرای لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا بەدەست هێناوە.

– وەك ئەمینداری ئەنجومەنی باڵای پلاندانان کاری کردووە، پاشان وەك ئەندامێك لە دەزگای خوێندن لە کۆلێژی زانستی کارگێڕیی لە زانکۆی "شاهـ سعود) لە ریاز و سەرۆکی بەشی زانستە سیاسییەکان لە هەمان زانکۆ دەستبەکار بووە.

– یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی یەکێتیی قوتابیانی ئیسلامیی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کەنەداو یەکێتیی ئیسلامیی جیهانیی بۆ ڕێکخراوە قوتابییەکان و کۆمەڵەی زانایانی کۆمەڵناسیی موسڵمان لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و کەنەدا، هەروەها پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی لە

ویلایەتە یەکگرتووەکان و گۆڤاری ئەمەریکی بۆ زانستی کۆمەڵناسی ئیسلامیی لە ساڵی ١٩٨١ – ١٩٨٤ و سەرۆکی کۆمەڵەی زانایانی کۆمەڵناسیی موسـڵمانی ویلایەتە یەکگرتووەکان و کەنەدا (١٩٨٤ – ١٩٨٨) بووە.

– بەڕێوەبەری زانکۆی ئیسلامیی جیهـانیی لـە مالیزیـا بـووە لـە (١٩٨٨ – ١٩٩٩).

– خاوەنی چەندین کتێب و توێژینەوەی زانستییە کە گرنگی بە بوارەکـانی داهێنــان و چاکـسازیی ئیـسلامیی دەدەن و تایبــەتن بــە ئوممــەت، هــەروەها بەشداریی بەرچاوی هەبووە لە کردنەوەی چـەندین کـۆنگرە و کـۆڕی زانـستیی جیهانیی گرنگ.

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پازدەهەمی کۆچی (١٤٠١ ك — ١٩٨١ ز) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

— فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لە پێناو تەئصیلکردنی مەسەلە هەمەکییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الکلّیات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

— گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیری و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامیی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بە ئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

— چاکسازیی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاڕاستەکردنی کاروانی ژیاری مرۆڤایەتی و بەرچاورۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە هەبێت.

بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی، پەیمانگا چەند هۆکارێك دەگرێتە بەر، لەوانەش:

— بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستیی و فیکریی.

– هاوكـاريى هـەوڵ و كۆشـشى زانـا و توێـژەرەوەكانى زانكـۆ و بنكـەكانى توێژینەوەى زانستيى و، بڵاوكردنەوەى بەرهەمە زانستييە نايابەكان.

– ئاڕاستەكردنى توێژینەوە زانستيى و ئەكاديمييەكان لە پێناو خزمەتكردن بە فيكر و مەعريفەدا.

هەروەها پەيمانگا چەند نووسينگە و لقێكى لە پايتەختى وڵاتـە عـەرەبيى و ئيـسلامييەكان و وڵاتـانى تـريش هەيـە، كـە لـە ڕێگەيانـەوە كـار و چـالاكييە جۆراوجۆرەكانى خۆى ئەنجام دەدات، هەروەها چەند ڕێكەوتننامەيەكى لەگـەڵ ژمارەيەك زانكۆى عەرەبى و ئيسلاميى و خۆرئاوايى لە سەرانسەرى جيهاندا بۆ هاوكاريى زانستيى هاوبەش هەيە.